

مەولانای ڕۆمی
ئازاد قەزاز
١٩٨٥
چاپی دووەم
٢٠١٣

ناوی کتێب : مەولانای ڕۆمی

نوسینی : ئازاد قەزاز

نوبەتی چاپ: چاپی دووەم ٢٠١٤

بوار : ژیان و مەعنەوییەت

لە بڵاوکراوەکانی: کتێبخانەی بێخود

چاپخانە : چاپخانەی چوارچرا

نرخ: (٣٠٠٠) دینار

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە ( ٢١٩٩ )
ی ساڵی ٢٠١٣ی پێدراوە

## پێشەکی چاپی دووەم

لە نێوان چاپی یەکەم و ئەم چاپەدا نزیکەی سی وسێ ساڵ تێپەڕیوە. چاپی یەکەم کە لە ١٩٨٥ زاییندا دەرکەوتووە، ئەوا ئەم چاپی دووەمە لە ساڵی ٢٠١٤ زاییندا دەردەکەوێت. لەم بەینەدا کۆمەڵگەی کوردی لە کوردستانی باشووردا، ئاڵوگۆڕی زۆری بە خۆیەوە دی. لەسەروبەندی چاپی یەکەم، ئاڕاستەی سیاسی کورد کە لە کۆمەڵگەی کوردی ئەوساکەدا، ئاڕاستەیەکی ویستراو بوو، بەڵام ئەو سیاسەتە لە ناو شاخەکاندا خۆی شاردبۆوە، هەمان شاخ بۆ پاراستنی پیرۆزگەرایی ئەو سیاسەتە، دەمامکێکیش بوو. بەڵام لە سەروبەندی چاپی دووەمدا سیاسەتی کوردی باشور هەنوکە لە ناو شاخدا نییە، وا لە ناو شاردایە و دەمامکی لابردووە، جەوهەری خۆی دەرخستووە و هیچ پیرۆزییەکی پێوە نەماوەتەوە. هەر لەم بەینەدا کوردستانی باشوور کیمیا باران، ئەنفالکردن، ڕاپەڕین و کۆڕەوەی بە خۆیەوە دی و تا گەشتە ئەوەی بە هۆی لە باربوونی دۆخی نێودەوڵەتییەوە، هەرێمێکی

سەربەخۆش پێکەوە بنێت. لەم کەینوبەینەدا کوردستان هەر لەڕووی سیاسییەوە گۆڕانی بەسەردا نەهات، بەڵکو لە ڕووی بزاڤ ئایینیشەوە ڕەنگ و ڕوخساری خۆی گۆڕی. بۆ نموونە لە یەك ڕەوتی دینی بزاڤ ئیخوان موسلیمینەوە، بەرەو فرە ڕەوتی ئایینیەوە هەنگاوی نا. ڕەوتی دینی ئیسلامی سیاسی، ڕەوتی دینی ئیسلامی جیهادی، ڕەوتی دینی ئیسلامی سەلەفی و ڕەوتی دینی ئیسلامی سۆفیگەریش سەریهەڵدا. لە نێوەندی ئەم هەموو بەزموهەڵایەدا، مەولانا بێدەنگ و سەنگ، مات و کز، بێناز و بێکەس، ئاوڕی لێنەدەدرایەوە. کەس نەبوو دەستی حیکمەت و ئەشقی مەولانا بگرێ و بیخاتە نا ئەو گشت کین و ڕقانەوە کە بەربینی ئەو خەڵکەی کوردستانی گرتبوو. هەڵبەت لێرەدا مەبەستم لە مەولانا دوو مەولانایە، مەولانایەکی کورد و مەولانایەکی فارس، مەولانایەکی باشور و مەلانایەکی بەڵخ، مەولانایەکی سلێمانی و مەولانایەکی قۆنیە، واتە مەولانا خالیدێکی نەقشبەندی و مەولانا جەلالەدینێکی مەولەوییە. وا هەنوکە پاش ئەو گشت هەراسانی و دوودڵی و نائارامییە، مەردوم جارێکیتر دەیەوێ بگەڕێتەوە لای ئەشق و خۆشەویستی مەولاناکان، بگەڕێنەوە لای ڕاستگۆکان، بگەڕێنەوە ئامێزی گەرمی سۆفییەکان، تا خۆیان لە ململانێکانی ڕەوتی سیاسەتی نەتەوەگەری، ئیسلامی سیاسی، جیهادی و سەلەفی وەدوور خەن و ساتێك لە ناو ئەشقی

ئەوانــەدا بحەوێنــەوە. گەڕانەوەیــەکی شـکۆدارە بـەرەو گـەرمی ئەشق و کوڵی بەسۆی خۆشەویستی، گەڕانەوەیەکی بەنرخە کە دەریـدەخات چـەندین سـاڵە بـە نـاوی ئـایین و نەتەوایەتییـەوە، مرۆڤـی کوردسـتانی باشـوور ئـەتۆرێنن، بـەڕۆحێکی تینـوو و کەساسـەوە چـاوەڕوانی شـەونمی بەربـەیانی ئەشـقی مـەولانا دەکـەن تـا تاسـەیان بشکێنێت. بـەڵی ئـەوا گـەنجانن جـارێکیتر ڕەوتی ئایین و سیاسەت بەرەو مرواری هـەقیقی بن زەریاکانی دەبەنەوە. دەستتان خۆش گەنجانی ئازیز کە منیشتان لەتـەك خۆتـان گـەنج کـردەوە، بـەو داوایـەتان کـە مـەولانا جـارێکیتر چاپکەنەوە، منتان بەرەوە یادەوەری سی و سیٚ ساڵ لەمەوبەر بردەوە و مەولاناتان لای خۆتان زیندوو کردەوە.

ئەو مەولانایەی کە ئێمە لەم کتێبەدا قسەی لەسەر دەکەین، مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی بەڵخییە، کە بە مەولانای ڕۆمی ناسراوە.

بەچاکی دەزانم پێش ئەوەی بچینە ناو دووتوێی کتێبەوە، ڕۆمی بناسێنین و هەندێك ئەزمونی خۆم لەمەڕ ڕۆمی ئاشق بخەمە بەردەستی خوێنەر. ڕۆمی سالی ١٢٠٧ لە شاری بەلخ کە سەر بە ئەفغنستانی ئێستایە ئەو کات سەر بە ئێران بوو، هاتۆتە دنیاوە. هەر بۆیە لەدەڤەری ئێران و ئەفغانستان جەلالەدین بە بەلخی ناسراوە بەلام لە تورکیا بە جەلالەدینی

ڕۆمی ناسراوه چونکه زۆربه‌ی ژیانی له ئه‌ناتۆلی به‌سه‌ر بردووه. ئه‌ناتۆلی له‌کاتی ئه‌ودا ناوچه‌یه‌کی بێزه‌نتی رۆمانی بووه، له‌وێوه ناویان ناوه ڕۆمی. وشه‌ی (مه‌ولانا) ی له تورکه‌کانه‌وه وه‌رگرتووه که مانای (گه‌وره‌م) ده‌به‌خشێت. له ڕۆژهه‌لاتی جیهانی ئیسلامیدا، ڕۆمی له‌پاش سه‌ده‌ی سیازده‌وه ناسکترین و خۆشه‌ویسترین سۆفی بووه. دیوانه‌که‌ی به ناوی مه‌سنه‌وی که ٢٦ هه‌زار دێڕی له‌خۆگرتووه, له‌لایه‌ن شاعری فارس (جامی) یه‌وه ناوی قورئانی فارسی لێنراوه. شاعیر و بیرمه‌ندی موسلمان به‌ڕه‌چه‌ڵه‌ك هیندی، موحه‌مه‌د ئیقبال، مه‌سنه‌وی بۆ خۆی وه‌ك خدری زینده بینیوه. نازم حیکه‌مه‌تی کۆمۆنیستیش زۆر به په‌رۆشه‌وه له نوسینێکیدا به ڕۆمی ده‌لێت: منیش موریدێکی تۆم ئه‌ی حه‌زره‌تی مه‌ولانا.

نوسه‌ری ئه‌لمانی هۆگۆ فان هۆفمانستال سالی ١٨٢٠ سه‌باره‌ت به شیعرێکی ڕۆمی به‌سه‌رسامیه‌وه ده‌لیٚ: ئه‌م وته‌یه‌ی ڕۆمی له هه‌موو شتێك قولتره که ده‌لیٚ: **هه‌رکه‌سیٚ له هێزی سه‌ما تێبگات، له مه‌رگ ناترسێت. چونکه ئه‌و سه‌مازانه ده‌زانێت، چۆن ئه‌شق مه‌رگ ده‌کوژێت.**

ئیقبال له نوسێنیکدا سه‌باره‌ت به ڕسته‌یه‌ك که گۆته ی شاعیری ئه‌لمانی و ڕۆمی تیایدا یه‌کده‌گرنه‌وه، ده‌لیٚ: هه‌ردوکیان ئێستا وان له به‌هه‌شتدا. ئه‌و ڕسته‌یه‌ش که ئه‌و

دووانە تیایدا یەکدی دەگرنەوە ئەمەیە: ***ئەقڵگەرایی لە شەیتانەو ئەشقیش لە ئادەم.*** نوسەری کتێبی ڕۆمی بە زمانی هۆڵەندی (ئەننەماری سخیمەل) دەلیٚ زۆرن ئەوانەی لەگەل شاعیری کلاسیکی تورکی یەحیا کەمال ( ١٩٥٨) کۆچی دوایی کردووە ئەم شیعرە دەڵێنەوە:

نای بژەنە، ئەی ئەوکەسەی کە پەرۆشی شیعرەکانی دەتگەێنێتە ئاسمان:

بەپەرۆشی خۆری تەبریزیەوە (شەمسی تەبریزی) لە سەماکردندا دەبینە باڵەکانی مەولانا
ئێمە دەبینە پەڕێك لە باڵەکانی مەولانا!

هەنوکەش ژمارەی هەوادارانی ڕۆمی لە ئەوروپا و ئەمەریکادا ڕۆژبەڕۆژ لە زیادبووندایە.[١]

سەبارەت بە ئەزمونی خۆم لەمەڕ مەولانا، لە ناوەڕاستی ساڵانی هەشتای سەدەی ڕابوردووەوە دەستیپێکردووە. ماوەی چەند ساڵێك ڕۆمی سەرقاڵی کردبووم و کتێبەکەی بەناوی مەسنەوی ماوەیەکی باش سەرنجیان ڕاکێشابووم. ئەم کتێبەی ئیستە لە بەردەستایە بۆ یەکەمجار ساڵی ١٩٨٥ چاپکرا. مەخابن لەو

---

[١] Annemarie schimmel, *Rumi, Meesters in spiritualiteit, Averbode* ٢٠٠٢.

سەردەم و نێوەندە ڕۆشنبیریە کوردیەدا هیچ چەشنە بایەخێك نە بەو مرۆڤە و نە بەو کتێبەش دراوە. لەڕاستیدا سۆفیگەری ئیسلام یەکێك بوو لەو ڕەهەندە ماریفیانەی گرنگیم پێدەدا. هەر لەو سالانەدا سێ کتێبی ترم لەسەر شێخ عەبدولقادری گەیلانی و ئەحمەد فاروقی سەرهەندی و بەدیعولزەمان سەعید نورسی نوسی. بەلام نەمتوانی کتێبەکەی نورسی بەچاپ بگەیەنم، چونکە ئاراستەی بیرکردنەوەم لە پاش نەوەدەکانەوە بەرەو گۆران دەچوو و لەو جەنجالی بیرکردنەوەیەدا ئەو کتێبەی نورسیم لەبیر چۆوە و نەمزانی چی بەسەرهات. هەر لەو سەردەمە و پێش ئەوەش جگە لە سۆفیگەری، فەلسەفە و تیۆلۆژیای ئیسلام و بیری ڕۆژئاوایش کەمندەکێشیان کردبووم. لە پاش نەوەدەکانی سەدەی ڕابوردو ماوەی پتر لە پازدە سالە بێدەنگ بووم و ناو بەناو وتارێکم نوسیوە. وەلێ لەماوەی نێوان سالی ١٩٩٧ وە تا ٢٠٠٧، جگە لە خوێندنەوەی تایبەتی خۆم، لە دوو زانکۆی هۆلەندیدا، سەرگەرمی خوێندن بووم.

ئەم پێشەکیەم بۆ ئەوەبوو کە بۆ وا پاش نزیکەی ٣٣ سال، جارێکی دی ڕێم لە ڕۆمی دەکەوێتەوە. هەنوکە لە ڕۆژئاوا گرنگیەکی زۆر بە لێکۆلینەوە لە سەر ئیسلام دەدرێت و بەتایبەتیش سۆفیگەری زۆر سەرنجی ڕۆژئاوای ڕاکێشاوە. مەبەستم لە سۆفیگەری بەتەنها سۆفیگەری ئیسلام نیە، بەلکو

ڕەهەندە ڕۆحیەکانی گشت نەتەوە و کەلتورە جیاوازەکانی ئێستا بۆتە جێگە لێکۆلینەوەی زانکۆ و پەیمانگا پەیوەندیدارەکانی ئەو بوارە. لە چەند بابەتێکیتردا ئاماژەم بەوە داوە کە پۆستمۆدەرنە بایەخی داوەتەوە بە ڕەهەندی ڕۆحی مرۆڤ و لەڕۆژئاواش بە گشتی گرنگی دەدەن بە سیستەمی کۆمەڵایەتی میلتیکەلتورێل (پێکەوە ژیانی کەلتورە جیاوازەکان ) و خاڵی هاوبەشی نێوان کەلتورە جیاوازەکان و خاڵە جیاوازەکانیش شیکاری دەکەن. لەناو سۆفیگەریدا ئەوان دەرك بەوە دەکەن کە سنوری نێوان ئایینەکان بەزێنراوە و هەموو ئایینەکان بە یەك چاو دەبینرێن. لێرەوەیە دەلێم هەنووکە لە وڵاتە جیاوازەکانی ئەوروپادا مالپەر و ئینستیوتی جیاواز هەن و کۆڕو کۆبونەوەی تایبەت بە ڕۆمیش دەگیرێت. ڕۆمی یەکێکە لەو کەسایەتیە گرنگانەی کەوتۆتە بەرچاو، هەروەك بودا لەو کەسایەتیە گرنگانەیە حزورێکی بەرچاوی لە کۆمەلگەی ئەوروپیدا هەیە. لە ئەوروپادا هەنوکە ڕۆحیگەری گفتوگۆ و دیباتی زۆری لەسەر دەکرێت بەبێ جیاوازی کردن لە نێوان هیچ چەشنە ئاینێکی تایبەتدا، جا چ ئاینی کۆنی هەزاران سال لەمەوبەر بێت یان ئاینی سەدان سال

لەوە دەچێت لە قۆناغێکی گەشتی ژیانمدا، ڕۆمیم بە جێهێشتبێت و پاش پتر لە ٣٠ ساڵ بە خۆشحاڵییەوە بۆ لای

مەولانا دەگەڕێمەوە. بێگومان پتر لە ٣٠ ساڵ خوێندنەوە و ڕامان و بیرکردنەوە، گۆڕانی بنەڕەتی و ماریفی و ڕاگوێزانێکی تەواو لە ناخ و بیرکردنەوەی مندا ڕوویداوە. واتە گەڕانەوە بۆ لای ڕۆمی، نە ئەو ئازادە، ئازادی ٣٠ ساڵ لەمەوبەرەو نە ڕۆمیش هەمان ئەو ڕۆمیەیە کە ئەوکات خوێندومەتەوە. هەر بۆ نموونە ئەگەر لە قۆناخی لاوێتیدا ئەو دێڕەی سەرەوە ( ئەقڵگەرایی لە شیتانە و ئەشقیش لە ئادەم) بە حەرفی و ڕەهایی وەرگرتبێت، ئەوا هەنووکە لە ڕەهەندێکی میتۆسیەوە تێیدەڕوانم و بە چاوێکی زانستیانە دەیخوێنمەوە، بێ ئەوەی لە بەهای ئەو دێڕە تۆزقالێك کەم بووبێتەوە، چونکە مرۆڤ بەردەوام ئیستعارەی وشە دەکات تا پێناسەی هەقیقەتی پێبکات، بێئەوەی بتوانێ خودی هەقیقەت بپێکێت. ئێمە دەتوانین لە تێڕوانینی زانستی سەردەمەوە، هەمان مەبەست، هەمان پەیام بە وشە و چەمکی دی بخەینە ڕوو، بەو مەرجەی هیچکام لەو تێرم و وشانەمان لێنەبێتە هەقیقەتی ڕەها" چۆن؟

لەوەتەی مرۆڤ چاوی کردۆتەوە، هەقیقەتێکی شاراوە سەرسامی کردووە. ئەم دۆخە سایکۆلۆژیە وای لە مرۆڤ کردووە کە هەمیشە لە بیرکردنەوە و تێڕاماندا بژی. ئەم جۆرە تێکۆشانە گەشە بە بیرکردنەوەی مرۆڤ دەدات و هوشیاربوونەوەی بە دوادا دەهێنێت. سەرسامبوون و

هوشیاربوونەوە کە لەم گەشتە ماریفیەدا دەخولقێت، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕێبازەکان. بەدرێژایی مێژوو، هێندەی درێژەی پرۆسەی سەرسامبوون و هوشیاربوونەوە، هێندەش ڕێبازی ماریفی سەریهەڵداوە. ئەو مرۆڤەی بەم گەشتە ماریفیەدا دەگوزەرێت، کۆمەڵێك وشە و تێرم و ڕستە و تێکست دەخولقێنێت، کە مرۆڤگەلی تر بە هاسانی تێیناگات، چونکە ئەو وشەگەلانە بە ئەزموونی کەسی ئەو عارفە گەشتیارەوە لەو ئان و سات و دەوروبەرەدا، پەیوەستە.

ئەوەی ئەو مرۆڤە دەخاتە ڕێ، بۆ ئەوەی ئەو گەشتە سازدات، ئەوە پرسیارەکانی ئەقڵە. کاراکتەری ئەقڵ وایە کە بەبەردەوام پرسیاردەکات، لە هەمانکات خوازیاری وەڵامێکە قایلی کات، دەنا مرۆڤ ناحەوێتەوە. لەبەر ئەوەی ئەقلیش پارچەیەکی مەزنی کاراکتەری مرۆڤی پێکهێناوە، 'مرۆڤ ناتوانێت لە ئاست پرسیارەکانی بێدەنگ بێ و دەستەوسان بوەستێت. خۆ بێدەنگکردن لە ئاست پرسیارەکانی ئەقڵ، نیشانەی لاوازی کەسێتی ئەو مرۆڤە بێدەنگەیە. پرسیارەکانی ئەقلیش هەمیشە وردبونەوەیە لەو دۆگمایەی لەو سەردەمەدا باڵ بەسەر مرۆڤدا دەکێشێت و هەناسە لە بیرکردنەوەی نوێ دەگرێت. واتە ئەقل گومان دەخاتە ئەو ئایدیۆلۆژیایەی وەك هەقیقەت خراوەتە ڕوو

و پیرۆز کراوە و قسەکردن لەسەری حەرامکراوە. بۆیە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە بڵێین گومانکردن، بوێرییە.

گەر بە چاوێکی زانستیانە بە مێژوودا بچینەوە، تێبینی ئەوە دەکەین کە گشت ڕێبازە ئاینی و فەلسەفی و سۆفیگەریەکان لەسەر ئەم بنامەیەی سەرەوە دامەزراون. ڕێبازەکە بەوە تەواو نابێت تەنها گومان بکات، بەلکو دەبێت لەبری ئەو دۆگمایەی کە ئەقڵ کون و کەلەبەرەکانی ڕوناك دەکاتەوە و کەم و کورتیەکانی دەردەخات، ئەلتەرناتیڤێکیش ببەخشێت، دەنا گەشتەکە بێمانا دەبێت. لەبەخشینی ئەم ئەلتەرناتیڤەوە، ئیدی ڕێبازێکی نوێ دەخولقێت، پاشان ئەمیش دەبێتەوە دۆگمایەکی تر و مرۆڤ خۆی لە پاڵیدا دەحەوێنێتەوە. واتە ئەقڵگەرایی دادەمرکێتەوە، هەڵوەشانەوە دەوەستێت، مشت ومالکردن لەو ساتەوە کۆتایی دێت، پێکهێنانەوە ڕوودەات و حەوانەوە دەستپێدەکات. لێرەوە قۆناغی عەشق و خۆشەویستی دەخولقێت. ئەو مرۆڤە تێکۆشەرە گەشتیارە عارفە لەو خەباتەی خۆی ڕازی دەبێت، هەست بە ماندوبوونی خۆی دەکات، خۆی دەناسێت، تواناکانی خۆی بۆ ئاشکرا دەبێت، بەرزی و نزمی ناخی خۆی بۆ دەردەکەوێت، بەکورتیەکەی خودهوشیاری پەیدا دەبێت. ئەم خودهوشیارە دەبێتە خاوەنی خۆی و ئەشقێك بۆ خودی خۆی و مرۆڤ و گەردوون بۆ ساز دەبێت.

دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە بڵێین: ئەقڵگەرایی سەرچاوەی ئەشکەنجەی مرۆڤە و ئەشقیش سەرچاوەی حەوانەوەی مرۆڤە. لێرەوە سەرەرای ئەوەی کە خودی مرۆڤ خۆی سەرچاوەی شەیتانە و سەرچاوەی ئەشقیشە، کەچی ئەقڵ دەخاتە سەنگەری شەیتانەوە و ئەشقیش دەخاتە سەنگەری خۆیەوە. هەر لەبەر ئەوەی کە مرۆڤ خۆی ناناسێت، بۆیە ئەم جیاکارییە لە نێوان ئەقڵ و ئەشق و شەیتان و مرۆڤ دەخوڵقێنێت.

گوزارش کردن لەم دۆخە سایکۆلۆژییە، لەلایەن مرۆڤەوە لە هەر سەردەمە و هەرکۆمەڵگە و کەلتورێکدا بە وشە و تێرمی جیاوازبووە، گەرچی زۆرجاریش لێکچوون لە نێوانیاندا پەیدا بووە. وشەی شەیتان وشەیەکە لە بیری ئایینیەوە خوڵقاوە، وەك هێمایەك بۆ ئەو کاراکتەرە خراپانەی لە مرۆڤەوە دەردەچێت. واتە وشەی شەیتان میتافۆرێکە بۆ گوزارش کردن لە هەقیقەتێك کە مرۆڤ خۆی هەستی پێدەکات، وەلێ نەیزانیوە چییە. ئیمرۆی زانستی مرۆناسی بە تایبەتی سایکۆلۆژیا زۆر بە روونی دەتوانی بەبێ وشەی شەیتان قسەی خۆی لەسەر ئەو کاراکتەرانەی مرۆڤ بکات. بۆیە ئیمرۆ ئێمە دەلێین شەیتان ئەفسانەیە، چونکە شەیتان ئەو مەخلوقە سەربەخۆیە نیە کە لەدەرەوەی مرۆڤ بتوانین قسەی لەسەر بکەین تا بیخەینە چوارچێوەی زانستی ئەزمونگەرییەوە، وەلێ دەچێتە ریزی

ئەفسانەوە، چونکە وەك شتێکی دەرەکی پێمان ناسەلمێنرێت. هەرلەبەر ئەوەشە چونکە ئەقل سەرچاوەی ئەشکەنجەی ڕۆحی مرۆڤە و دۆگما باوەکان وەك بت دەشکێنێت، زۆرجار شپەرزەیشی لێدەکەوێتەوە و بەرژەوەندی دەسەڵاتدارانی ئەو دۆگمایە دەخاتە مەترسیەوە، لە ڕیزی شەیتان ناوزەد کراوە و مرۆڤی پێدەترسێنن. خۆ ئەگەر عەقل نەبێت یان وەك میتافورێك شەیتان نەبێت، بیرکردنەوە و گەشەکردنی مرۆڤیش دەوەستێت. ئەو چیرۆکەی کە ئایین بۆ خودا و شەیتانی هۆنیوەتەوە، میتافورێکە بۆ ئەو ململانێیەی نێوان چاکە و خراپە، ئەقل و ئەشق. دەبینین هەر خودا خۆیەتی کە شەیتانیشی خوڵقاندوە و کەچی لێشی هەڵدەگەرێتەوە. بۆیە لە هەندێ نوسینی تردا ئاماژە بەوە دەدەم کە خودا نەپێچینە ناو ململانێی خۆمانەوە، چونکە هەموان بۆ خودا وەك یەکین.

لەم لێکدانەوەیەی سەرەوەدا لەو مەبەستەی ڕۆمی تێدەگەین کە بۆ دەلێ ئەقڵگەرایی لە شەیتانە وئەشقیش لە ئادەمە. لە کۆتای گەشتە ماریفیەکەیدا دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە جگە لە بیرکردنەوە، قۆناغێکی تریش هەیە و دەبێ مرۆڤ بیگاتێ کە ئەویش ئەشقە. چۆن مرۆڤ لەو ئەشقە دەگات، گەر ئەو گەشتە ماریفیە جێبەجێ نەکات؟ بۆیە ئەشقێك بە قۆناغێکی ئەقڵی لەو چەشنەی سەرەوە ئاماژەمان پێدا، گوزەر نەکات، ئەشقێکی

کوله، ئەشقێکی سارد وسڕە، نە هیچ دەبڕێت و نەکەسیش گەرم دەکاتەوە. بۆ ڕاستێتی ئەم قسەیەم ئەم بەیتە شیعرەی ڕۆمی دەخەمە ڕوو کە دەڵێت:

ئەو کاتەی ئەشق، لە سینەمدا تاوی خۆی ستاند

هەرچی تیابوو، بەو کلپەیەی منی سووتاند

هەرچی ئەقل و چی کتێبە، خستمەلاوە

شیعر و مۆسیقا و گۆرانی، منیان گەیاند[٢]

ئەوەی کە لێرەدا گرنگە بیلێم ئەوەیە، ئەم جۆرە وتانە کە لەلایەن هەندێ سۆفی و زانا لە ناو ئیسلامدا دەبێژرێن، لەلایەن کەسانی سەلەفیگەراوە خراپ دەقۆزرێنەوە و بە ناشرینی شرۆڤەدەکرێن. دەشێ ئەو سۆفی وزانایەنەش لەو کاتەدا نەگەشتبنە ئەو هەقیقەتەی کە لەسەرەوە لەسەر ئەقل و شەیتان و ئەشق خستمانە ڕوو. بۆیە پاش ئازاردانی ئەقڵیان و حەوانەوەیان لە پاڵ ئەشق و سۆفیگەریدا، لە ئەقل پاشگەز دەبنەوە. نمونەمان بۆ ئەم حالەتە ئەبوحامیدی غەزالییە. پاش ئەوەی کە لە ڕێگەی سۆفیگەرییەوە دەحەوێتەوە، هێرش دەباتە سەر فەلسەفە.

---

[٢] مثنوي جلال الدين الرومي, ترجمة محمد عبدالسلام كفافي, الجزء الاول, بيروت ١٩٦٦ ص٥

ئەم سەردەمەدا باشتروایە ئێمە لەبری ئەوەی ئەقڵ و ئەشق بکەین بە گژ یەکدا، دەبێت بە دوو قۆناغی جیاوازی گەشتی ماریفیان دانێین. بە تایبەتی لەمڕۆی ململانێی نێوان جیهانی ئیسلامی و جیهانی ڕۆژئاوا، زیندوکردنەوەی سۆفیگەری بایەخێکی زۆری دەبێت بۆ پێکەوە ژیان و خۆسازدان و خۆگونجاندن لە ناو سیستەمی دیموکراسیدا. چونکە سۆفیە مەزنەکانی ناو مێژووی ئیسلام وەك ئیبن عەرەبی، سوهرەوەردی، حەللاج و ڕۆمی ...هتد) توانیویانە سنوری ئایدیۆلۆژیای ئیسلام ببڕن و جەوهەری ماریفەی ئاینی ببوژێننەوە. ئەوەی من دەیبینم لەمڕۆی جیهانی ئیسلام دا، ئیسلام تەنها ئایدیۆلۆژیایەکە، کە ماریفەی لە دەستداوە. لە ماریفەی ئاییندا، گشت ئایینەکان یەك بەها وەردەگرن و یەکسان دەبن. ئەمە ئەو دۆخەیە کە دیموکراسی و عیلمانیەت بۆ مرۆڤایەتی دەیخوازێت.

بۆنمونە ئەم بەیتە شیعرەی ئیبن عەرەبی کە نزیکەی حەوسەت سال لەمەوپێش گوتویەتی تابلێی مرۆڤانەتر و هوشیارانەتر و دیموکراسیترە لە چاو ئەو ئایدیۆلۆژیایەی هەنووکە جیهانی ئیسلامی هەڵگریەتی. بەیتە شیعرەکەی ئیبن عەرەبی دەڵێ:

سینەم بۆتە هەڵگری گشت وێنەیە
بۆ ئاسکان لە وەرگایە

لای ڕاهیبان پەرستگایە
بۆ خۆی بۆتە بوتخانەیە

هەر ئاواشە ئەو کابەیە
بۆتە لەوحێکی تەورات و پەڕاوی قورئانی تێدایە
مل کەچی ڕێی خۆشەویستیم
لە هەرکوێ بێ کاروانەکەی، منیش لەوێم
هەر خۆشەویستی باوەڕمە

ڕێبازیشمەوئاینەکەم

لە کۆتاییدا دەڵێم دەبێت جیهانی ئیسلامی توێژی سەرەوەی ئایینی ئیسلام، دەبێ تێپەڕێنێت، تا بتوانێ بە خۆی وەك مرۆڤ ئاشنا بێتەوە و لەگەل جیهانی ئیمرۆدا ئاشت بێتەوە. چونکە گەر ئایدیۆلۆژیای ئیمڕۆی ئیسلام توێژی سەرەوەی ئاین بێت، ئەوا سۆفیگەری قوڵایی و بنی ئەو ئاینەیە. گەر ئیبن عەرەبی وانەی یەکسانیبوونی ئاینەکان و خۆشەویستیمان پێبلێتەوە، ئەوا ڕۆمی بە مەسنەوی و سەماکەی دەیەوێت مەییێکمان پێبنۆشێت تا هەمیشە بە مەستی ئەو ئەشقەوە بمێنینەوە. ئەو وانەیەش فێردەبین چۆن ئەقل و ئەشق دووکاراکتەری دژ بەیەك نەبینین، بەڵکو پێکهێنەری مرۆڤن. واتە وانەی خۆ قورتارکردن لە دوالیزمەکان و ڕۆچوون بەرەو یەکبوونمان بێدەڵێنەوە.

دوالیزمـه شـرۆڤەکردن و تێکبەربوونـه، یـەکبوون بێـدەنگی و ڕابوونـه و جیاکردنـەوەی شـەیتان و ئـادەم وەك دوو هەقیقـەت ونبوونه، وەلـیٚ هوشیاربوونەوە لـەو دووکاراکتـەرەی مرۆڤ وەك دوو دۆخـی جیـاواز، بـه خـود ئاشـنابوونه. فـەرموون ئێـوە مـەولانای ڕۆمـی و گەشـتێك بـەناو ژیـانی ئـەو مرۆڤـه مەزنـەدا بکەن، خودا یار بێت، کتێبمان لەسـەر مـەولانای کوردیش دێتـه دنیاوە.

ئازاد قەزاز

۲۳-۱۱-۲۰۱۲ هۆڵەندا

## پێشەکی چاپی یەکەم

لە یەکەم سەرهەڵدانی ئادەمیزاد لە سەرزەوی و دەستپێکردنی ژیانی مرۆڤ، لەلایەن پەروەردگارەوە پێغەمبەران دەنێرران بەپێی زیادبوون و گۆڕانی کۆمەڵ، هەر کۆمەڵ و گەلێك پێغەمبەر و پەیامێکی تایبەتی ئاسمانی بۆ نێردراوە، بۆ ئەوەی خوداپەرستی و مەبەستی هاتنیان بۆ ژیانی دونیا شارەزایان بکات. جا ئەو پێغەمبەر و نێراوانە لەگەڵ بەرەو پێش چوونی کۆمەڵ و پێگەیشتنی عەقڵیان بۆیان نێراوە، وەناردنی ئەم نێرراو و پێغەمبەرانەش پەیتا پەیتا بۆ ئەوەی مرۆڤەکان ماوەی ئامادەیی ببڕن و زیاتر لەبیرو هۆش لەیەکتر نزیك ببنەوە. تا لەهاتنی دوامین پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" لەبیرو ڕاوە لەیەك نزیك بن. یانی ئەو پێغەمبەرانەی کە دەنێرران بۆ گەلێك یان هۆزێك بووە، تا لە ئەنجامدا "محمد " "صلى الله عليه وسلم" نێراوە هەموو دینەکان بوون بەیەك و یەکیان

گرت[٢]. چونکە محمد"صلی الله علیە وسلم "تەنها بۆ هۆزێك یا گەلێکی تایبەتی نەبوو، بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤی سەرزەوییە، یانی ئایینی ئیسلام بەستراوەتەوە بەهەموو مرۆڤ لەسەرزەوی بەتێکڕایی بێ جیاوازی لەنێوان هیچ هۆز و گەلێك. هەروەکو ئەوەی کە پێغەمبەرانی پێشوو "علیهم وسلام" لە کتێبێکی زۆر گەورە چەند پەڕاوێکیان هێناوە بەجۆرێك کە بگونجێ لەگەڵ ئاستی ڕۆشنبیری ئەو گەلەی کەبۆی هێناوە. تا ئەو ڕادەیەی کە ئاستی ڕۆشنبیریان بەرزبۆوە، عەقڵیان چەند پلەیەکی بڕی، ئەو کاتە ئەو پەڕاوانە هەموویان سەرلەنوێ کۆکرانەوە و لەگەڵ ئەو پەڕاوانەی مابوون و هێشتا نە نێررابوون کرانەوە بەکتێبە گەورەکەو بە محمد "صلی الله علیە وسلم" نێرایەوە. بێ گومان هەموو دەزانین باوەڕهێنان بەو کتێبە گەورەیە ڕاستترو گونجاوترە وەك لەو چەند پەڕاوەی کەلەپێشدا بۆ گەلێك یان هۆزێك هاتبێت. چونکە لە ڕاستیدا باوەڕ نەکردن بەکتێبە گەورەکە باوەڕ نەکردنە بەو چەند پەڕاوەی کە لەپێشدا لێی کراوەتەوە، بۆیە بەهاتنی ئایینی ئیسلام هەموو دینەکانی تر پوچەڵ بوونەوە. بەڵام پاش ئەوەی

---

[٢] مەبەست لەم یەکگرتنە لەلایەنی عەقیدەوەیەو هەندێك لەلایەنی تەشریعیەوە، چونکە تەشریع لەدینێکەوە بۆ دینێکی تر جیاوازی هەبووە لە هەندێك لاوە ئەویش بەهۆی بارودۆخی ئەوکات و شوێن و نەریت و ڕەوشتی ئەو گەلەی کە دینەکەی بۆ هاتووە.

ئایینی ئیسلام تەواو هاتە خوارەوە و کامڵ بوو، ئیتر پێویست بەوە نەما کە پێغەمبەری تربێت، بەڵکو پێویست بەوە هەیە کە هەموو جار مامۆستایەکی زانای تێگەیشتووی بلیمەت بێت و ئەو کتێبە گەورەیە شەرح و ڕاڤە بکات بۆ گەلی موسڵمان کاتێ کەلە بیریان دەچێتەوە. جالەبەر ئەوەی موسڵمانەکان وەکو هەموو مرۆڤێکی ئاسایی شایستەی لەبیر چوونەوەن، بۆیە پێویستە هەر سەد ساڵێك بەلایەنی کەمەوە مامۆستایەکی بلیمەتی لێ هاتوو پەیدا بێت ئەو کتێبە سەر لەنوێ شەرح کاتەوە و ڕوون کاتەوە بەپێی ئاستی ڕۆشنبیری ئەو خەڵکەی ئەو سەردەمە چونکە بەلایەنی کەمەوە نزیکەی سەد ساڵ جارێك نەوەی کۆن بەسەر دەچێت و، نەوەی تازە لەگەڵ هۆش و بیرو ڕۆشنبیری تازەی ئەوکاتەی تیایدا دەبێت بەهۆی ئەزموون و تاقی کردنەوەی ڕۆژانەیان، بەهۆی بیرکردنەوەو عەقڵ بەکار هێنان کەواتە ئەم هۆیانە دەبنە هۆی لەبیرکردنی سەردەمی ڕابردوویان، بەوەی کەوا تێبگەن هەرچی کۆن بوو بێ کەڵکە. کەواتە دەبێت مرۆڤ هەمیشە پردێك دروست بکات لەنێوان کۆن وتازە نەك بڵێ هەرچی کۆنە بێ کەڵکە. جا لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز فەرموودەی خوایە و نەگۆڕە و بۆ هەموو ئان وسات و سەردەمێك دەگونجێ و گومان نیە لەوەدا کە قورئان بۆ هەموو سەردەمێك ڕوویەکی تایبەتی خۆی هەیە، دەبێت ئەو ڕووەی کەسەر بەو سەردەمەیە بخرێتە ڕوو، یانی

قورئانی پیرۆز بەئاوێنەیەکی بازنەیی زۆر گەورە دەچوێت، کەبەهەزاران پارچە دابەش بووەو زۆریش بەتوندی پێکەوە نووسان، وە هەر سەدەیەك و چەرخێك سەر بەڕوویەکە لەو ڕووانە، وەئەوەی گرنگە لێرەدا شارەزاو لێزانێك وە مامۆستاو بلیمەتێك بە ئیلهامی خوای گەورە، ئەوەی سەر بەو سەردەمەیە لەو ڕووانە ئاڕاستەی ئەو خەڵکەی ئەوسەردەمەی بکات خۆ ئاوێنە هەر ئاوێنەیە و هیچی لێ نەگۆڕاوە. جا لەئەنجامی ئەو جێ گۆڕکێ و گۆڕانکارییەی ڕوویداوە لەو چەرخەدا چەند شتێك لەجێی خۆی نەماوە و لەجێی خۆی دانەنراوەتەوە. وە ئەوەی لێرەدا پێویستە شارەزایەك بێت ئەوەی لە جێی خۆی نەماوە بیخاتەوە جێی خۆی و ئەو بۆشاییەی کە پەیدابووە لە ئاکامی زۆربوونی خەڵکی و زیادبوونی ئاتاجی ماددی و فیکری خەڵکی پڕکاتەوە بەشتێکی گونجاو، ئا ئەوەی بەم کارە هەڵدەستێت پێی دەوترێت (مجدد)[٤]. تەماشا دەکەین پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" دەربارەی ئەمە دەفەرمووێ"ان اللة تعالی یبعث لهذة الامة علی راس کل مئة سنة من یجدد لها دینها"[٥]. بۆ نمونە لەسەردەمی "ئیمامی غەزالی" فەلسەفە

---

[٤] نوێکەرەوەی ئایین –لەبەر ئەوەی وەکو زاراوەیەکە لە زمانی عەرەبیدا نوسیورمە(مجدد)مان بەباشتر زانی.

[٥]رواە ابو داود والحاکم والبیهقی عن ابی هورەیرە –حدیپ صحیح

بەجارێك پەرەی سەندبوو کە خەریك بوو مێشکی موسڵمانان بەجارێك تێك بدات. ئەم هات و فەلسەفەی خستەوە جێی خۆی و سنورێکی بۆ دانا، ئەوەی بەکەڵك هات هێشتیەوەو، ئەوەی بێ کەڵك بوو فڕێیدا. بەدانانی چەند کتێبێك گرنگترینیان (احیاء علوم الدین) بوو. بۆ نمونە لەم سەردەمەی خۆماندا چەندان پیاو پەیدابوون وەکو نوێکەرەوەیەك هەڵدەسوڕان، یەکێك لەوانە مامۆستای هەڵکەوتووی زەمانە "سەعیدی نوورسی" یە، تەماشا دەکات زانست بەڕادەیەك زاڵ بووە بەسەر خەڵکیدا خەریکن دەیپەرستن و هەموو شتێکی تریان لەبیر چۆتەوە، (بدیع الزمان) سنوری بۆ زانست دانا و خستیەوەجێی خۆی، بەنووسینی"پەیامەکانی نوور"[٦]. بەڵام لەسەردەمی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی فەلسەفە بەجۆرێکی وا جۆشی بەعەقڵ سەندبوو کە هەموو سۆزو عاتیفەیەکی ووشك کردبوو، بەڕادەیەك عەقڵ پەرەی سەندبوو کەخەڵکی تەنها فێری شەڕە قسە و قسەبازی کردبوو، دڵ و دەروونیان لەبیر چوو بۆوە، بۆیە مەلانا ڕاپەڕی و عەقڵی خستەوە جێی خۆی و سنوری بۆ دانا و مافی خۆی دایەو بە "مەسنەوییەکەی"سۆزو عاتیفەی خەڵکی

---

[٦] چونکە لەم چەرخەدا گومڕایی زانستی (الضلالە العلمیە) پەل و پۆی بۆ بناغەکانی ئیمان هاویشتووە بە نووسینی پەیامەکانی نوور توانی لەم لایەنە بەتەواوەتی ڕوون بکاتەوە بێ ئەوەی لە نووسینەکانیدا دین و زانست لەیەك جیا بکاتەوە

جۆش و خرۆشدا و کڵپەی ئاگرینی بەردایە دڵی خەڵکی بەباسی ئەوین و عەشقی حەقیقی، دەنگی لەناو ئومەتی ئیسلامیدا زرنگایەوە، بەڕادەیەك دەڵێ ئەوەی دڵداری حەقیقی نەبێت هیچ جۆرە چێژێك لەئیمان و ژین نابینێت وەدەیەوێت تێمان بگەیەنێت، گەر خۆمان نەسوتێنین بەئاگری عەشق نابینە ئەو کەسەی کەبتوانین دەورێکی تەواو لەخزمەت کردندا ببینین، هەروەکو چۆن کۆتەڵە دارێك کە جوان سوتا و ئەم دیوو ئەو دیو کرا تا چاکتر بسوتێ، بێگومان لەئاکامدا دەبێتە خەڵوزێکی ڕەش و پشکۆیەکی جوان و ڕەنگین و گەشاوەی بێ دووکەڵی لێ دەردەچێت، گەر ئێمەش بەئاگری عەشقی حەقیقی خۆمان سوتان و، ئەم جەستەیەمان بەتەواوەتی ڕەش بۆوە وەکو خەڵوز، ئەو کاتە ڕۆحەکانمان دەبێتە پشکۆیەکی بڵێسەدار و گڕێکی بێ دووکەڵ.

بۆیە بەپێویستم زانی ئەم پیاوە مەزنانەتان پێ بناسێنم بۆ ئەوەی تێ بگەن کە بەدرێژایی مێژووی ئیسلام لەسەردەمی پێغەمبەرەوە"صلى الله عليه وسلم" تاوەکو ئیمڕۆی ئێمە ئەم ئیسلامە بێ مامۆستاو و ڕابەر نەبووە، دیسان بۆ ئەوەی کەڵك لەخۆیان و ژیانیان و تێکۆشان و ئامۆژگارییان وەربگرین، نەوەك تەنها بەوەندەوە بوەستین کە خۆمان بەسەردەمی پێغەمبەر"صلى اللهعليه وسلم"و هاوەڵەکانیانەوە ببەستینەوە،

چونکە زۆرجار ئەمانەویٚ ژیانی ئەوان بهێنینەدی، وەڕاستەو خۆ لەوانەوە وەری بگرین.. بەڵکو پێویستە ئەوە بزانین کە نوێکەرەوە لە چەرخی خۆیدا پردێکە لەنێوان سەردەمی پێغەمبەر و چەرخەکەی خۆی کە تیایدا دەژی .عومەری کوڕی عبدوالعزیز کە بەنوێکەرەوەی یەکەم دادەنریٚ بابزانین چی فەرمووە لەو سەردەمەی خۆیدا کەسەرەڕای ئەوەی خەلیفەی موسڵمانانی ئەو سەردەمەی خۆی بووە دەڵیٚ "دەترسم کە دین بەشێوەیەکی وابچەسپێنم بەسەر خەڵکیدا کەلە تواناياندا نەبێت، ئەمجا گیرو گرفتێکم تووش بێت کە بۆم چارەنەکرێت بۆیە لەگەڵ دینەکەدا شتێکی دونیایی موباح تێکەڵاو دەکەم بۆ ئەوەی دڵیانی پیٚ نەرم بێت و بێزار نەبن"[7] وقد روى عن الامام

---

[7] بۆ گۆڕینی باوی خراپ و ڕەوشتی ناشرین پێویستە پەنا ببرێتە بەر هەندێك شتی موباح بۆ ئەوەی جێگای ئەو باوە خراپە بگرێتەوە، ئايینی ئیسلامیش ڕێگای داوە بەبانگ کەرانی بۆ ئەم جۆرە گۆڕینە، ئەویش بەدروست کردنی خۆشەویستی و دڵ ڕاگرتن. تاکو دڵیان بکەنەوە بۆ کاری خێرو چاکە و بەئاسانی لەو ڕەوشتە ناشرینە واز بێنن.

بۆ نموونە ئەو کەسەی کەلەناو زۆنگاوی خراپەکاریدا دەتلێتەوە، بۆت هەیە کە خۆشەویستی لەگەڵدا دروست کەیت و دڵی ڕاگرێت، بۆ ئەوەی واز لەو شتە خراپە بێنێت . . باوکێك کوڕەکەی یان هاوڕێکەی قومار چی یە، لەبەرامبەر ئەو قومارکردنە فێری وەرزشیان کات و وەلەهەر یارییەکدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا خەڵاتێکی پێشکەش کات: یان فێری سواری و ڕمبازی و...هید، کات بۆ ئەوەی ئەو بۆ شاییی یەی کە لە ژیانی پەیدا دەبێت بەو وازهێنانە لەو قومارکردنە بەو وەرزش و یاری کردنە پڕکاتەوە، جا ئەگەر ئەوکەسە خەریکی هاتووچۆی مەلهاکان بێت با لە جیاتی ئەوە گەشت و گوزاریان پیٚ بکات، وە ئەگەر بەرتیل خۆرە یان حەزی لە خواردنی ماڵی خەڵکە و بەلاش خۆرە بالەجیاتی ئەوە کرێکەی زیاد کات . . ئەم چارەسەر کردنەش هەندێکیان لە دەست کاربەدەستی ئەو ناوچەیەدایە هەر بەم شێوەیە . . . ص ٤٨١ اصول الدعوە للدکتۆر عبدولکەریم زیدان.

الفية عمر بن عبدالعزيز انةو قال "والله ما استطيع ان اخرج لهم شيا من امر الدين الا ومعه طرف من الدنيا استلين بة قلوبهم خوفا ان ينخرق على منهم مالا طاقة لى به"[٨] بەڵێ(مجدد) ئاوا لەسەردەمی خۆی تێدەگات کە پێویستە. تەماشا دەکەین کە عومەری کوڕی عبدوالعزیز نامەیەك دەنووسێ بۆ کوڕەزاکەی عومەری کوڕی خەتتاب خوایان لێی ڕازی بێ لەنامەیەکدا داوا دەکات کە سیرەتی باپیری بۆ بنوسێ بۆ ئەوەی لەسەری بڕوا وەکو ئەو بکات .. کەچی وەڵامی کوڕەزاکەی عومەر ئەوە بوو" تۆ عومەر نیت و ئەوانەی لە چوار دەورتن، ئەوانە نین کەلە چوار دەوری عومەر بوون، بۆیە پێویستە لەسەرت، وا ئیسلامەکە بچەسپێنیت کەلەگەڵ توانای خەڵکی چوار دەورت بگونجێ". بەڵێ بۆیە پێویستە ئاگامان لەنزیکترین (مجدد) بێت لە ئێمەوە بۆ ئەوەی چاویان لێ بکەین و شوێن پێ یان هەڵگرین. وەئەبێ ئەوە بزانین (مجدد)ی هەموو چەرخەکان وەك یەکن و جیاوازیان نیە، تەنها لە چۆنیەتی دروست کردنی دەرمانی ئەوچەرخە و شێوازی بەخشینەکەی نەبێت، بۆیە گەر جێ گۆڕکێ یان پێ بکرێت ئەو دەورە دەبینن کەلەو سەردەمەدا

---

[٨] الخواطر-سعيد رمظان

پێویسته جالەم بارەیەوە مامۆستا "سەعیدی نوورسی" دەفەرمووێ "ئەگەر من لەچەرخی (ڕۆمی)دا بژیامایە (مەسنەوی)م دەنووسی، ئەگەر (ڕۆمی)یش لەم چەرخەدا بژیایە پەیامەکانی نووری دەنووسی".

لەکۆتاییدا دەڵێم بۆیە پێم خۆشە کە ئەم پیاوە مەزنە بەگەلی کورد بناسێنم چونکە تا ئێستا وای دەربارە نەنووسراوە، تەنها کاک ئەحمەد تاقانە کورتەیەکی ژیانی نووسیووە لەگەڵ وەرگێڕانی سرودی نەی (بەناوی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی و سروودی نەی). وەمامۆستا محمد شڵماشی تەنها هەندێك لەچیرۆکەکانی لەزمانی فارسی یەوە کردووە بە کوردی بەناوی (ئاوێنە) خوا پاداشتی چاکەیان بداتەوە، وەهیوادارم لە کەم و کوڕی ببورن، خوداوەندی مەزن یاریدەدەرمان بێت.

ئازاد ڕەووف عارف

ڕانیە ١٩٨٥

# سەردەمی مەولانا

جیهانی ئیسلامی پێویستیەکی زۆری بە کەڵەپیاوێکی لێهاتوو و بلیمەتی وەها هەبوو، نویٚ کەرەوەی ئەم ئایینە بێت، کەبەلێکۆڵینەوە و ووردبوونەوەی، چووبێتە ناو جەرگەی فەلسەفەو بەسەلامەتی لێی هاتبێتە دەرەوە، لەپاشان بەتەجرەبەی خۆی بۆی دەرکەوتبیٚ کە فەلسەفە سەرابێکە نەزان بەئاوی تێدەگا، وەبتوانیٚ بەووردبوونەوەو توێژینەوەو لێکۆڵینەوە، تەلیسمی لەفزی و دەهۆڵی بۆشی فەلسەفە دەرخات، بۆ ئەو کەسانەی تەجرەبەیان دەربارەی فەلسەفە نیە و، تیایدا قووڵ نەبوونەتەوەو، ئارەزوویان لێیەتی و شوێنی دەکەون. جیهانی ئیسلامی لەو کاتەی پێویستی بەکەسێك بوو، کەبتوانیٚ بەو دڵە پڕ لەسۆز و بەو عاتیفە بەهێزەییەوە، گیانێکی نویٚ بکاتە بەر ئەو کۆمەڵگایەی کەتیایدا عەقڵ زاڵبوو بوو لەسەر حیسابی عاتیفە، کزی و مەلوولی ڕووی تیٚ

کردبوون. کەسێك بێت کە بتوانێ قسەزانی(علم الکلام )یەکی تر بێنێتە کایەوە، لەسەر شێوازێکی نوێ و بەگژ عەقڵدا نەچێت. مەبەست ئەوەیە تەنها بریتی نەبێت لە شەڕە قسەو بەزاندنی ئەمو ئەو، بەڵکو بریتی بێت لەکردنەوەی گرێ کوێرەی فیکرو دەروون، کەقسەزانی لەپاش خۆی بەجێی هێشتووە، وەبەخشینی ئارامی و نوری ئیمان بەدڵە بەبەرد بووەکان.

ئەو پیاوەی کە پێویست بوو بۆ ئەم کۆمەڵگا و سەدەیە بەدی هات لەکەسایەتی مەولانای ڕۆمی، وەدیوانی هۆنراوەکەی کە ناسراوە بە (مەسنەوی معنوی ) شۆڕشێك بوو کرا بەسەر قسەزانیداو هێزو پێزی لێ بڕی، وە ڕەخنەیەکی زۆریشی گرت لە فەلسەفە لەڕووی بەرنامەو ڕاڕەویەوە، ئەو فەلسەفەیەی کەلەسنوری تایبەتی خۆی لایدا بوو، وەزیادە ڕەوی کردبوو لە مل کەچێتی بۆ (حەواسەکان) هەستیارەکان و عەقڵ پەرستی، تەنانەت بنەمایەك بوو بنیات نرا بۆ قسەزانیەکی نوێ، کەزیاتر قەناعەتی دەبەخشی بەو عەقڵە سەرکێش و هەمیشە هەڵچووە، بەو دەروونە پەشێوو شڵەژاوانە، لەئاستی ئەو عیلمی کەلامەی، کەبەدرێژایی سەدەکان کردبووی بەپیشەی و بانگی بۆ دەکرد.

# ژیان وبەسەرهاتی

مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی لەشەشی(ربیع الاول)ی ساڵی ٦٠٤ك لەشاری "بەڵخ"ی ناوچەی خۆراسان هاتۆتە دنیاوە، بۆیە هەندێك جار بەجەلالەدینی بەڵخی یان مەولەوی بەڵخی ناو دەبرێت. باوکی کە "موحەمەدی کوڕی حسینی خەتیبی بەکری" یەو نازناوی "بەهائەددین وەلەدە" و بەشای زانایان ناسراوە، وە لە ڕەسەن و وەچەی ئەبوبەکری صدیقە"خوا لێیان ڕازی بێت". مەولانا جەلالەددین دەستی کرد بەخوێندن لای شێخ "بورهانەددین موحەقیقی تەرمەزی" کە یەکێك بوو لە قوتابیەکانی باوکی و لە سەردەستی ئەو پێگەیشتووە .. جا باوکی مەولانا "شێخ بەهائەددین" ڕەخنەیەکی زۆری دەگرت لەزانایانی سەردەمی خۆی، دەربارەی ئەوەی کە خۆیان خەریك کردووە بەزانستە عەقڵییەکانەوە و، هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر دەدەن بۆ ئەوەی فێری ببن، وە دوورە پەرێزن لە قورئان وحەدیس. شێخ (بەهائەددین) ی باوکی مەولانا زۆر بەسام و بە هەیبەت و بە ویقار بوو، زۆر ڕێزی لێ دەگیرا لەلایەن خەڵکیەوە بەگشتی و، زانایان و هەڵکەوتوانی سەردەمی خۆی بەتایبەتی، وەلە هەموو لایەکی وولاتەوە داوای فەتوایان لێ دەکرد، ئەو خەڵکە زۆرەی کە لە دەوری کۆبووبوونەوە ڕقی"خوارەزم شا"ی هەستان و داوای بە جێ هێشتنی وولاتەکەی لێ کرد، ئەویش بەخۆی و بنەماڵەکەیەوە کۆچی کرد.

له زۆر لەو شارانەی هاتوونەتە ڕێگای، مەنزڵی تیاداکوتاوەو، خەڵکی ناوچەکە زۆربەگەرمی پێشوازیان لێ کردووە، ڕێزیان گرتووە، تاوەکو بەتەواوەتی لە"قۆنیە" لەساڵی ٦٢٦ك جێگیربووەو بەیعەتی بەست لەگەڵ "عەلائەددین کەی قوباد"ی سوڵتانی ڕۆم کە زۆربە جوانی پێشوازی لێ کردو، ڕێزێکی زۆری لێ گرت.

جا لەکاتی ئەم کۆچ کردنەدا، لەساڵی١٢١٢ی زاینیدا بە شاری "نیساپور"دا تێدەپەڕن، چاویان بە "فەرەیدەدینی عەتتار" ی صۆفی و خواناس و شاعیری مەزن دەکەوێت، جەلالەدینی پێنج ساڵانەی دەچێتە دڵەوەو، هیوای سەرفرازی بۆ دەخوازێت و، نوسخەیەك لەکتێبی "ئیلاهی نامە" و هەندێك دەڵێن"ئەسرارنامە"ی پێ دەبەخشێ.

شێخ بەهائەددین دوو ساڵ لەشاری "قونیە"دا مایەوە و تا ساڵی ٦٢٨ی ك دنیای بەجێ هێشت، پاشان کوڕە پێگەیشتووە هەڵکەوتووی کەمەولانا بوو جێی گرتەوە.

میربدرالدین "کهرتاش" مامۆستای سوڵتان خوێندنگایەکی بۆ مەولانا بنیات نا، کەناسرا بەخوێندنگای"خوداوەندکار" و وەقفێکی زۆریشی بۆ بڕیەوە، مەولانای کرد بەسەرۆك و لێپرسراو تیایدا.

مەولانا بەردەوام بوو لەوانە ووتنەوەو ئامۆژگاری و ڕابەری کردن لەسەر شێوازی باوکی مەزنی، ئەم پایە بەرزە و جێگە

پیرۆزە، نەبووە هۆی بەربەستێك، لەڕێگای فراوان كردنی خوێندن و خۆشارەزاكردنو لێكۆڵینەوەو، قووڵ بوونەوە لەزانستەكاندا، تاوەكو لەساڵی "٣٦٠ی ك" ڕووی كردە وولاَتی شام و لە خوێندنگای "حەلەوی"یە ی شاری حەلەب نیشتەجێ بوو، وەكەڵكێكی زۆری وەرگرت لە كەمالەدینی كوڕی عەدیم، زانایانی حەلەب دانیان نابوو، بە لێهاتوویی و هەڵكەوتوویی و، بەرفراوانی ئەو لەزانستدا پاشان لە حەلەبەوە ڕووی كردە دیمەشق لەوێ لەخوێندنگای "موقەددەسیە" دامەزر، بەردەوام كۆڕی دەبەست لەگەڵ شێخ محی الدین عەرەبی و، شێخ سعدالدین ی حەمەوی و، شێخ عوسمانی ڕۆمی و، شێخ ئەوحەدەدینی كرمانی و، شێخ صدرالدینی قۆنەوی، كە هەموویان لەو سەردەمەدا لەدیمەشق كۆببونەوە.

مەولانا لەساڵی "٦٣٤ی ك" گەڕایەوە "قونیە"، كەوتە خۆ خەریك كردن بە وانەووتنەوە و فتوادان، زۆربەی ئەو زاناو پیاو ماقوڵانەی كشان بەرەو "قونیە"، زیاتر ئەوانە بوون كە وولاَتەكەیان بەجێ هێشتبوو لەترس و بیمی فیتنەی"تەتەرەكان"، بۆیە ببووە شاری زانست و، مەڵبەندی زانایان و هەڵكەوتوان، هەروەها هاوەڵەكانی شێخ "محی الدیین عەرەبی"، پاش مردنی هەر لەوێ جێگیر ببوون لەوانە شێخ صدرالدین قونەوی بوو. مەولانا لێ بڕابوو بۆ وانە وتنەوەو فەتوا دەركردن، وەخوێندنگاكەی نزیكەی (٤٠٠) كەس وانەی تیا

دەخوێند.

مەولانا بەردەوام بوو، لەدەرس ووتنەوەو گەڵك گەیاندن، هەروەکو مامۆستایەکی خوێندنگاو زانایەکی ئاینی دەژیا، تاڕووداني ئەو ڕووداوەی کەتەوژم و ڕاڕەوی ژیانی بەتەواوی گۆڕی و، قەریحەی کردەوەو بەهرەی ژیانی بڵێسەی سەند، کە هۆکارێك بوو بۆ ناوبانگ دەرکردنی و دوور بینینی و نەمری ئەو پیاوە بەرزە.

لە "جمادی الاخرە"ە ساڵی ٦٤٢ ی ك پیاوێکی صۆفی لە تەورێزی ئێرانەوە گەیشتە قونیە، کە ناوی "موحەمەدی کوڕی عەلی کوڕی مەلیك داد" بوو، ناسرا بوو، بە شەمسی تەورێزی، خەڵکی کەم ئاگای ڕەسەن و ئەحواڵی ژیانی بوون، ڕۆژێکیان مەولانا جەلالەددین لەگەڵ کۆمەڵێك لەزانایان و قوتابیانی سەردەمی خۆی بەڕێگادا دەڕۆیشت، خەڵکێکی زۆریش چوار دەوریان دابوو، پرسیاریان لێ دەکردو کەڵکیان لێوەردەگرت. لەم کاتەدا "شەمسی تەورێزی" هاتە پێشەوەو لێیان نزیك بۆوەو، ووتی: مەبەست چیە لە خوێندنی ماتماتیك و زانستی؟ مەولانا ووتی: بۆ ئاگادار بوون و شارەزا بوون لەئادابەکانی شەرع... شەمسی تەورێزی بەو پەڕی متمانەو لەسەر خۆییەوە ووتی: نەخێر . . بەڵکو گەیشتنە بەزانراوە (معلوم)ەکان، وە ئەو بەیتە هۆنراوەیەی "حکیمی ثنائی" خوێندەوە کە تیایدا دەڵێ: "ئەگەر زانستێك نەفست پێنەگرێت، نەزانی زۆر باشترە لەو زانستە"بۆیە

جەلالەددین واقی ورماو، شەمسەدین نیشانەکەی پێکاو، ئەو تیرەی بۆی هاویشت گرتی.

مەولانا لەگەڵ مامۆستا تازەکەیدا گەڕایەوەو بۆ ماوەی چل ڕۆژ بەیەکەوە مانەوە، لە هەندێك ڕیوایەتدا دەڵێن کە بۆ ماوەی شەش مانگ لەگەڵیا لە ئیعتیکافدا بووە، لەهۆدەکەی "صلاح الدین" زەرکوب "الدقاق" کە ڕێگە بەهیچ کەس نەدەدرا بچێتە ژوورەوە بۆ لایان جگە لە "صلاح الدین" خۆی نەبێت، جەلالەددین بەم بەیەك گەیشتنە پڕ بوو لە گیانێکی تری نوێ، جیهانێکی تری لێ ئاشکرا بوو، کە پڕ بوو لە حەقائیق و ئەزواق[٩]، ڕاستی ئەمەش، مەولانا خۆی دەست نیشانی کردووە لەیەکێك لەبەیتەکانیدا کە دەڵێ "شەمسی تەورێزی بوو، ڕێبازی حەقیقەتی پێنیشاندام، هەر ئەویشە قەرزار باریم لە گەیشتنمدا بە ئیمان و یەقین". سوڵتان وەلەد کە کوڕی مەولانایە دەڵێ " ئەو مامۆستا مەزنە، بوو بە قوتابیەکی بچوکی شێخی تەورێزی، کە هەموو ڕۆژێك دەرسی لێوەردەگرت، سەرەڕای ئەوەی کە پلەیەکی زۆرشارەزاییانەی بڕی بوو لە زانستەکان و زۆریش تێگەیشتبوو، لە زوهدیشدا زۆر پێشکەوتوو بوو، بەڵام لەلای ئەم مامۆستایە عیلمێکی نوێیی بەدی کرد، کەبەهیچ جۆرێك ئاگای لێ نەبووە".

---

[٩] ڕاستی و چەشە.

مەولانا بەتەواوەتی مل کەچی شێخە تازەکەی بوو بەو پەڕی گەشەو زەوقەوە ڕووی بەلای ئەودا وەرگێڕاو، بەتەواوەتی لەقوتابی و موریدەکانی بێ ئاگا بوو، ئەم ڕووداوە سەختەش زۆرگران بوو بەلایانەوە، بووە هۆی هەڵچونیان و دەیانووت هەموو تەمەنمان لە پێناوی خزمەت گوزاری شێخدا بەخشی، وە کەرامەتمان بەچاوی خۆمان دی، بەهۆی ئێمەوە ناوبانگی بەهەموو لایەکدا بڵاو بۆوە، پیاوێکی نەدیوی نەناسراو هات و لە ئێمەی کرد و لێی داگیرکردین، هیچ چارێکمان نیە بۆ بەیەك گەیشتن و بینینی، دەرس و محازەرەکانی پەکی کەوت و وەستان، بێگومان دەبێت ئەم پیاوە پیاوێکی سیحر بازبێت، یاخود لێزان و قسەزانێکی زۆر لێهاتوو بێت، وا ئەم کێوە داکوتراوەی بەزانست و زانین، بەم شێوەیە هەروەك پوشکەیەکی بێ نرخ یان کاغەزێکی سوکەڵە ڕاپێچ کرد.

دوژمنایەتیان لەگەڵ "شمس الدین" پەرەی سەند، بڕیاریان دا لە قونیە دەری بکەن، بۆ ئەوەی جارێکی تر ڕوخساری مامۆستاکەیان ببیننەوە، پاشان ببنەوە گەلێکی چاك، بەڵام "شەمس الدین" ئارام و حیلمێکی زۆری نواند بەرامبەر بەم کارەساتە، تا لەسنور دەرچوون،"شەمس الدین" ترسا شەڕو ئاژاوە ڕوو بدات ، بۆیە بەدزییەوە لە قونیە دەرپەڕی، ئەمەیش لەشەوالی ساڵی ٦٤٣ ی ك بوو پاش هاتنی بۆ قونیە بەساڵێك و چوار مانگ.

جەلالەددین زۆرخەمبار بوو، بە وون بوونی مامۆستاکەی، بە ڕادەیەك وازی هێنا لە گشت قوتابی و موریدەکانی، وە ئەو هیواو ئاواتەی بەتەمای بون پاش دەربەدەرکردنی "شەمس الدین" بۆیان نەهاتە دی، بەڵکو بووە هۆی بێ بەش بوونی هاوڕێیانی ڕاستگۆو بەوەفا لەکەڵك وەرگرتن لە شێخە مەزنەکەیان.

شێخ بە دابڕاوی مایەوە لە خەڵکی و گۆشە گیر بوو، وازی هێنا لەکارو پیشەی خۆی تاوەکو لەناکاودا نامەیەکی شێخ"شەمس الدین"ی پێ گەیشت لە دیمەشقەوە، بەم نامەیە دەرووونی جەلالەددین ئاوی خواردەوە و برینی ساڕێژ بوو، پاشان گەڕایەو بۆ کۆڕی گوێ گران هەروەکو جارانی پێشوو، زۆر بەڕوویەکی گەش و پڕ لە سۆزەوە ڕووی کردە ئەو کەسانەی کەبەشداریان نەرکردبوو لەدەربەدەرکردن و ئازاردانی "شەمس الدین" پاشان نامەیەکی پڕ لەسۆز و خۆشەویستی نووسی بۆ"شەمس الدین"کەلە یەکێکیاندا دەڵێت:

ئەی نووری ناو دڵ وەرە

موڕادی ناو دڵ وەرە

ئەی ئەو کەسەی لەتۆوە

ئەوینم زانی وەرە

ئەی ئەو کەسەی گەیشتن پێت خۆشە

بەجودایت خەمباری و ناخۆشیە

تۆ وەك خۆر دوور و نزیکیت یەکە

## ئەی نزیکی و دوور وەرە

دڵ و دەروونی هەڵچوی خەڵکی دامرکایەوە، جەلالەدینیش کــە زانـــی خـــەڵکی وازیـــان هێنـــاوە لـــە دوژمنایـــەتی و دووبەرەکایـەتی لەگـەڵ "شـەمس الـدین"، کوڕەکـەی کـە نـاوی "سـوڵتان وەلـەد" بـوو لەگـەڵ دیارییـەکی زۆر گـران بەبەها نـارد بۆلای، بۆ ئەوەی ئەو دیارییانە بخاتە بەر پێی و داوای لێخۆش بوون بۆ ئەوانە بکات کە ئازاریان داوە لەگەڵ نامەیـەکی جـوان و ڕازاوە تیایدا داوای لێ کردبوو بگەڕێتەوە بۆ لایان لە قونیە.

بەڵێ "شەمس الدین"هاتـەوە قونیـە، جەلالـەددین زۆر دڵشاد بـوو، بەجووتــە کۆڕیــان گــەرم بـوو. ڕێـز و خۆشەویـستی زۆر زیادی کرد لە گەڵ شێخەکەیدا، بەلاّم ماوەیـەکی زۆر تێنەپـەڕی بەسـەر ئـەم نیعمەتـە تـا جـارێکی تـر ئـاژاوە و ئاشـووب بـەرپا بـۆوە، لەوکەسـانەی بەشـداری ئـاژاوەو ئاشـووبی ئـەم جارەیـان کرد کوڕە ناوەنجیەکەی خۆی بوو، کە ناوی "شلبی علاءالـدین" بوو، وە بۆ جاری دووەم "شەمس الدین"وون بۆوە.

ئەم جارە جەلالەددین سەری دنیای لێ هاتەوە یەك و گەیشتە تینـی، بۆیـە هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە بوونـە هـۆی ئـازاردان و، وون بوونی "شەمس الدین" دووری خستنەوە لە خۆی و دەری کـردن بـەلاّم ئـەم جارەیـان زیـاتر خـەریك بـوو بـە کـۆڕی گـوێ گرانەوە، ئەمەیش لە ساڵی ٦٣٥ی ك دابوو.

جەلالەددین شوێن نەما نەگەڕێ بە دوای شێخەکەیدا، جا کە

هیچ شوێنەوارێکی نەبوو، حاڵی بەتەواوەتی گۆڕاو تەنانەت نەیدەتوانی ساتێك ئارام بگرێت، هەردەم دەهات و دەچوو لە خوێندنگاکەیدا هەروەکو وێڵ بووبێت، بەڕادەیەك هەر نرکە نرك و ناڵە ناڵی بوو، بەردەوام خەریکی هۆنینەوەی شیعرو پەخشانی ڕەوان و پڕ لە سۆز بوو بۆ شێخەکەی .

ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان یەکێك لەگەڵیدا بدوایە دەربارەی شێخەکەی و بیووتایە چاوم پێی کەوتووە، یان بە خزمەتی گەیشتووم لە خۆشیدا جل و بەرگەکەی خۆی دادەکەند و پێشکەشی دەکرد.

جەلالەددین ڕووی نا بەرەو شام بۆ گەڕان بە شوێن"شەمس الدین" وە هەندێك لە هاوەڵەکانی لەم سەفەرەدا هاوڕێیەتیان کرد، پاشان گەیشتە دیمەشق و گڕی خۆشەویستی و عەشقی بەردایە دڵی خەڵکی دیمەشق، بەسەر سوڕسومانێکەوە دەیانووت: ئەو پیاوە کێیە کە پێگەیشتووی سەردەمی خۆی و، بێ هاوتای زەمانی خۆی بەم شێوەیە وێڵ و سەرگەردان کردووە؟!

جا لەپاش ئەوەی کە هیچ شوێن پێیەکی "شەمس الدین"ی بەدی نەکرد، بەدەروونێکی پڕ لە ئارامەوە ووتی: جیاوازی نیە لەنێوان من و "شەمس الدین"دا، ئەگەر ئەو خۆر بێت من زەڕەیەکم، ئەگەر ئەو دەریایەکە من دڵۆپێکم، جا نوری زەڕەش هەر لە خۆرەوەیە و، ژیانی دڵۆپێکیش هەر لە دەریاوەیە،

مەولانا سەر لە نویٚ گەڕایەوە قونیە".

لە "قونیە" چەند ساڵێکی تر مایەوە، بەڵام دووبارە ئاگری خۆشەویستی لە دەروونیدا کڵپەی سەندو، لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوڕێکانی گەڕایەوە دیمەشق پاشان کاتیٚ گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە خۆی عەینی "شەمسە" بەرەو"قونیە" گەڕایەو و ووتی من کاتی خۆی دەگەڕام بە شوێن "شەمس الدین" دا بەڵام گەڕانەکەم لە ڕاستیدا خۆی بریتی بوو لە پشکنین بە شوێن خۆمدا ئەوەی کەلە "شەمس الدین" دا هەبوو هەمووی لەخۆمدا هەیە، گەیشتبووە پلەیەك ئەوەی بەدی دەکرد لە "شەمس الدین" دا لە خۆشیدا بەدی دەکرد.

پاشان شێخ "سەلاحەددینی دەقاقی" کردە هاو نهێنی و خەلیفەو هاوڕێی ژیانی تایبەتی خۆی، وای بەسەر هاتبوو لەلای ئەو نەبوایە لای هیچ کەس دڵی ئارامی نەدەگرت.

سەلاحەددین بەم شێوەیە ژیانی گرتە بەر بۆ ماوەی بیست ساڵ تا ساڵی ٦٥٧ی ك وەفاتی کرد، پاش سەلاحەددین، شێخ جەلالەددین "شلبی حسام الدین" ی کردە هاوکۆڕو دانیشتنی تایبەتی خۆی، وە هەر ئەویش بوو بووە هۆکاری دانانی "مەسنەوی"، وە هەر بەهۆی ئەوەوە بوو دەروونی خرۆشاو قەریحەی کرایەوە، بەڵام کاتیٚ خێزانی حسام الدین وەفاتی کرد، بووە هۆی خەریك بوونی "حسام الدین"و، دوور کەوتنەوەی لە جەلالەددینەوەو، ئەمەش کاری کردە سەر

دەروونــی جەلالــەددینو، ووشــك بــوونی قەریحــەی مــەولاناو، وەستانی لە نوسینی مەسنەوی.

جەلالـەددین هـەر وەكـو لـەوەو پـێش باسـی حاڵیمـان كـرد، ئارام و پشێوی لێ دەبڕا، گەر لای یەكێك نەبوایە كە هاوگیری بێت و دەروونی لەگەڵ دەروونیدا بگونجێت، جا مامۆستاكەی كە ناوی "سید بهادین"ە یەكەم كەس بوو كە ئەم هاوگری و هاوسەرێتیەی لەگەڵیدا بووە جا كاتێ كە وەفاتی كرد، شێخ بۆ ماوەی پێنج ساڵ مایەوە، تیایدا هەستی بەبێ تاقەتیەكی زۆرو ژیانێكی غەریبی دەكرد، پاشان"شەمسی تەورێزی" هات و ئەو بێتاقەتیەی نەهێشت، بەڵام كاتێ كە دیار نەما دیسان ئەو غەریبیە ڕووی تێكردەوە، هەروا بەپەشۆكاوی و پەژارەوە مایەوە تاوەكو ئەو بۆشاییەی، بە "سەلاحەددینی دەقاق" پڕكردەوە و، پاشان بە"شلبی سەلاحەددین". هەروەكو بڵێیت ئەو بەهرانەی، كە خراونەتە دەروون و فیترەتیەوە، پێویستی بە یەكێك هەیە كە بیخروشێنێ و بیخاتە جۆش.

بەڵێ دانانی مەسنەوی، جگە لە وەڵامدانەوەیەكی ڕۆحی ئەم بانگەوازە شاراوەیە نەبێت هیچی تر نەبووە. جا هەڵبژاردنی هاوڕێ و هاوەڵانی ژیانی، وەكو سەلاحەدین و حسام الدین بە هۆی زانیاری و زوهد و كەشف و كەرامەتیانەوە نەبوو، بەڵكو بەهۆی گونجاوی ڕۆح و هۆش و دڵ و دەروونیانەوە بوو. وەباسی ئەوەشی كردووە كە هۆی جۆش و

خرۆشی بۆ سەلاحەدین، زیاتر لە یەكێكی تر، هۆكر بوونی پێیەوە، تەنها ئەوە بووە كە گونجان ڕوویداوە لەنێوانیانداو هیچی تر، وە فەرموویەتی: ئەگەر خۆشەویستێك بنیات نرا لەسەر گونجان، هیچ جۆرە پەشیمانیەكی بەدوادا نایەت نە لەدنیاو نە لەئاخیرەتدا، بۆیە ئەوانەی كە تێبینی ئەم گونجاندنەیان نەكردووە هەمیشە ئاواتە خواز دەبن و دەڵێن: "يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا"(٢٨)[10]، بەلام خۆشەویستانی بەیەكەوە گونجاو هیچ جۆرە ناكۆكی و، ڕقە بەرایەتیەك نیە لەنێوانیاندا، نەپەشیمان بوونەوە و نە لۆمەكردنی یەكتری تێدایە"الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ"(٦٧)[11]پاشان دەڵێت:" هەر ئەم گونجاندنە بوو كە ئیمانی دروستكرد لەناو سەحابەكان، وە دڵ و دەروونەكانی كێش دەكرد بۆ لای پێغەمبەر "صلی اللە علیە وسلم" وەفەزڵیش هەر بۆ ئەو گونجاندنە دەگەڕێتەوە، لە ئیمان هێنانی زۆركەس لە پێشینانمان، نەك بۆ موعجیزات، چونكە كەسێكی گونجاو لەگەڵ یەكێكی تردا سیفاتەكانی ئەو وەردەگرێت و، ڕەنگی ئەویش دەگرێت".

---

[10] سورەتی فرقان ئایەتی (٢٨).

[11] سورەتی زخرف ئایەتی(٦٧)

# وەفات کردنی مەولانا

لەساڵی(٦٧٢ی‌ك)دا شارەکەی جەلالەددین"قونیە" توشی بوومەلەرزە بوو، وە ئەم تەقینەوەو لەرینەوەیە هەفتەیەکی تەواوی خایاند، لەم کاتەدا مەولانا نەخۆش‌و، ڕەهەندەی جێگابوو، خەڵکیش لەم کاتە ناهەموارەدا زیارەتیان دەکردو داوای نزاو پاڕانەوەیان لێ کرد، بۆ ئەم بارە ناهەموارەی تێدان، ئەویش فەرمووی " زەوی برسیەتی و داوای پاروویەکی چەور دەکات، بەم زوانەش ئەم پارووە چەورە دەگلێت و لە پاشان ئێوەیش ئەم بەڵایەتان لەسەر لادەچێت".

وە هۆنراوەو پەخشانێکی زۆریشی دەخوێندەوە، کەتیایدا سۆزو ئارەزووی خۆی پیشان دەدا بۆ گەیشتنی بەخۆشەویستەکەی وەپێشوازییەکی گەرم و گوڕی لەمردن دەکرد، بەدەروونێکی فراوان و ڕوویەکی گەشەوە. یەکێك لەهاوڕێکانی کە ناوی "سەدرەدین" بوو هات بۆ خزمەتی و، دوعای بۆ کرد و داوای شیفایەکی زوو بە زووی بۆ کرد، مەولانا عوزری بۆ هێنایەوەو فەرمووی: شیفای خوای گەورەیش بۆ تۆبێت، بەڵام... ئاخۆ لابردنی پەردەی نێوان دوو خۆشەویست چ زیانێکی تێدابێت؟! جا لەو کاتەی لەسەرەمەرگ

و گیانەلاّ بوو، فەرمووی :" ئەگەر تۆ خاوەن باوەڕ و شیرین بێت، ئەوا مردنەکەیشت زۆر خۆش و بەتام وشیرینە، چونکە مردن خاوەن باوەڕە، وە ئەگەر تۆیش کافرو تالّ و بیّ تام بیت، ئەوا مردنەکەشت کافرانەو تالّ وگرانە". بەو جۆرە بەبەردەوامی خەریکی ڕوونکردنەوەی حەقایق و زانین بوو، تاوەکو گیانی پاکی لەگەڵ خۆرئاوا بووندا لەسالّی (٦٧٥ی‌ك) بەرزبووەوە بۆ ئاسمان و، بەدیداری خۆشەویستەکەی شادبوو کەهەمیشە گریەو زاری بوو بەدوایدا.

کاتێك تەرمەکەی بەرەو گۆڕستان هەڵگیرا، خەڵکێکی زۆری شارەکەی داباری بەسەرداو، ژمارەیەکی یەکجار زۆری لیّ کۆبوونەوەوە تەنانەت زۆر لەشوێن کەوتوانی ئایینەکانی تر، بەشداری هەڵگرتنی تەرمەکەیان کرد بۆ گۆڕستان و، هەموو بەجاریّ بۆ گیانی پاکی مەولانا دەگریان و، غەم و پەژارە دایگرتبوون. جولەکەو دیانەکان لەم بەڕیّ کردنەی مەولانادا بەدەنگی بەرز ئینجیل و تەوراتیان دەخوێندەوە، موسڵمانەکان، هەرچەندە لایان دەدان ودووریان دەخستنەوە بیّ سوود بوو، ئەم باسەیش گەیشتەوە دەم فەرمانڕەوای وولاّت، بەقەشەو ڕاهیبەکانیان ووت، ئێوە چیتانە بە سەر ئەم کارەوە؟ ئەوە تەرمی زانایەکی موسڵمانانە، ئەوانیش لە وەلاّمدا ووتیان

"بەهۆی ئەوەوە حەقیقەتی پێغەمبەرەکانمان زانی وە لە خوورەوشتی ئەودا سیرەتی ئەولیا پێگەیشتووەکانمان بینی".

لەبەرە بەیانەوە تەرمەکەی کەوتەڕێ و دەمەو ئێوارە گەیشتنە گۆڕستان و لەشەودا نێژراو بەخاك سپێردرا.

# سیفات و ڕەوشتی

مەولانا وەرزش و موجاهەدەیەکی نەفسی بەهێزی هەبوو، وە عیبادەت و خواپەرستیەکی زۆری هەبوو،" سەبەسالار" کە چەندەها ساڵ هاوڕێیەتی کردووە دەڵێت،" قەت بەبەرگی نوستنەوە نەم دیوە، وەهیچ کاتێ سەرین و نوێنی نووستنم لەلا نەدیوە، جا ڕۆژێك خەو زاڵ بوبێت بەسەریا ئەوا بەدانیشتنەوە لێ ی دەخەوت"لەیەکێك لەبەیتە شعرییەکانیدا ئەوەی دەرخستووەو دەڵێت " چۆن یەکێك خەو دەچێتە چاوی و ئەم دیوو ئەو دیو ناکات ئەگەر لەسەر دڕکەزێ بنوێت"؟! جا ئەگەر کاتی نوێژ بهاتایە ڕووی دەکردە قیبلەو ڕەنگی تێك دەچوو زۆریش لەنوێژەکەیا تێ ڕادەما، وە "سەبەسالار" دەڵێت" چەند جار بینیومە کەلە کاتی نوێژی عیشاوە نوێژی دابەستووە بە ڕادەیەك هەموو ئەو شەوەی بردۆتە سەر لەیەك ڕکاتدا".

جەلالەددین لە شعرەکانیدا وەسفی نوێژەکەی کردووە بە شێوەیەکی زۆر جوان و شەوقدار، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نوێژکردنەکەی بریتی یە لە نوێژی یەکێکی وێڵ‌و، خۆشەویست‌و، تیٚ ڕامان لەو نوێژەدا، ئاگای لە خۆی نامێنیٚ و، خەریك دەبێت لەگەڵ پەروەردگاری خۆی هیچ هەستێکی نامێنێت دەربارەی کات و شوێن، لەگەڵ هەموو کڕنووش بردن‌و، سوژدەبردنێکدا فرمێسك دەڕژێت‌و دەچۆڕێت بەسەر ڕیشەکەیداو دەتوێتەوە لەناو خۆشەویستیداو کڵپە دەسێنێت.

جارێك لەکاتی نوێژکردندا دەگریاو چاوەکانی فرمێسکی تیا هەڵ دەقوڵیٚ و کوڵمی گەشاوەی‌و، ڕیشە ناسکەکەی لەبەر فرمێسکی زۆر هەموو تەڕ ببوون، سەرماکەی قونیەش لەزستاندا زۆر توندە، فرمێسکیش لە ڕوومەت‌و ڕیشەکەی دەیبەستێت‌و، دەبێت بەشەختەو ئەویش هەر لەنوێژی خۆیدا بەردەوامە و ئاگای لیٚ نیە.

زاهیدێکی کەم خۆر و، بەقەناعەت بوو هەموو ئەو دیاریانەی کە بۆی دەهات لەلایەن پاشاو میرو دەوڵەمەندەکانەوە، هەمووی دابەش دەکرد و دەیبەخشین بەهەمیشەیی خۆی بیٚ بەش دەکرد، زۆریش دڵ خۆش دەبوو، هەرکاتیٚ لەهەژاری و برسێتیدا بوایە، هەموو جار لەم کاتانەدا

دەیووت" ئا ئێستا هەست بەلێبڕانم دەکەم بۆ خواو، هەست بە بونی لاوازێتی خۆم دەکەم بەرامبەر بە خودای گەورە".

زۆر پیاوێکی سەخی و دڵ فراوان و بەخشەرو لەخۆ بووردە بوو جا ئەگەر سواڵ کەرێك بهاتایەو داوای شتی لێ بکردایە و هیچی نەبوایە، ئەوا کراسەکەی یان عەباکەی خۆی پێ دەبەخشی، لەبەر ئەو هۆیە هەمیشە کراسێکی لەبەر دەکرد کەبەئاسانی دابکەندرێت، وە زۆر بە تواناو بەئارام بوو.

ڕۆژێك بەرێگایەکدا دەڕوات سەگێکی نووستوی چاو پێ دەکەوێت، کەبەپانایی ڕێگاکەدا لێی ڕاکشاوە، ئەویش لێرەدا ڕاوەستاو چاوەڕێی بێدار بوونەوەی ئەو گیان لەبەرەی دەکرد، زۆر بەلایەوە ناخۆش بوو، بیشێوێنێ و لە خەو هەڵیسێنێ، لەوکاتەدا پیاوێك بەوێدا ڕەت دەبێت و، لەخەو هەڵیدەستێنێت و سەگەکەیش سڵەمیەوەو ڕێگاکەی بۆ چۆڵکردن، بەڵام مەولانا ئەم کارەی بەلاوە پەسەند نەبوو، وەپێ فەرموو: "ئازارت پێگەیاند".

ڕۆژێکیان بەلای دوو کەسدا تێپەڕی خەریکی شەڕە جنێو بوون یەکێکیان بەوی تریانی دەووت: ئەگەر تۆ یەك جنێو بەمن بدەیت من دەجنێووت پێ دەدەم ئەویش لەم کاتەدا لەلایان وەستاو، پێی ووتن: تکایە بووەستن بۆ من ئەگەر هەزار جنێوم

پێ بدەن من یەك جنێوتان پێ نادەم، لەم كاتەدا هەردوو پیاوەكە ئاشت بوونەوە.

زۆر سووربوو لەسەر كاسبی حەلاڵ، زۆریش ڕقی لە بێ ئیشی و ڕزقێك بوو كەبەبێ ماندو بوون بۆی دەهات، جا مانگانە نزیكەی ١٥ دیناری وەردەگرت لە ئەوقافەوە، جا ئەویش لەبری ئەم پارەیە فەتوای بۆ خەڵكی دەنووسی. تاوەكو ئەو پارەیە حەلاڵ كات، هەمیشە ئامۆژگاری قوتابییەكانی دەكرد كەزوو خەبەری بدەنێ ئەگەر هەر كەسێك هات بۆ فەتوا تا زۆر دوا نەكەوێت لەوەلاًم وەرگرتنەوەدا.

گۆشە گیر بوو لە خەڵكی، زۆر زوهدی هەبوو لە پەیوەندی بەستن لەگەڵ سوڵتان و فەرمان ڕەواكاندا. ئەگەر میرێك عوزری بۆ بهێنایاتەوە كە بۆ نەچووە بۆ لای ئەویش دەی وت: پێویست ناكاتِ بە عوزر هێنانەوە چونكە نەهاتنتم پێ خۆشترە بۆ لام وەك لە هاتنت.

# مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی

# خاوەن بیرو هۆشێکی داهێنەرو دامەزرێنەری

# -علم الكلام- ێکی نوێ

## "مەسنەوی مەعنەوی" بابەتی و ئامانجی

مێژووی ژیانی"مەولانا" ئەوە دەگەیەنێت کە "مەولانا" خاوەن عاتیفەیەکی بەهێز بووە لە ویژدانیدا گیانێکی هەڵگیرساوو دڵێکی شەیدای بووە، خاوەن تواناییەکی گەورەو بەهرەییەکی مەزن بووە، ئەو قوڕەی کەلێی دروست بووە هەر بەخۆشەویستی شێلراوە، ئەم کڵپە و گڕەیەش وای لێ کردووە کە زۆر بەشپرزەیی پەلاماری زانستە ڕووکەشەکان-الظاهری- بداتو، زیاتر خۆی خەریك بکات بەزانستە عەقڵیەکانەوە جا شەمسی تەورێزی هات و ئەو گڕە شاراوەیەی لەوەوپێشی ناو دڵ و دەروونی هەڵ گیرساندو کڵپەداری کردو، ئەو تەبیعەتە داپۆشراوەی بە پاشماوەی نەریت شوێنەوارو ڕۆشنبیری پەروەردەی ئەو سەردەمەی بزواندو خستیە جووڵە.

کاتێك زانرا"جەلالەددین"دارێکی گڕاوی خلپەدارو پشکۆیەکی سوورەوەبووە، چاوی دڵێکی کراوە، دەروونێکی هەستیاری پڕ لەشەوقە، بەڵێ هەستیارە ناواخنەکان-باطنی گڕیان گرتو، پەردەی سەر پێڵووی چاوەکانی لاچوون ئەو حەقائیقە مەلآس دراوانەی ژێر لەفزی بۆ ئاشکرا بوون وماناو مەبەستی زۆری بەسەردا باری و، دڵ و دەروونی زانستی ڕاستەقینەی زۆری تێهات، بە ڕادەیەك کاسەکەی پڕ بوو تا لێی ڕژا. بەڵێ هەر کەسێك ئەمە شان و شەوکەتی بێت بێ گومان ناتوانێت بێ دەنگ بێ و نەجوڵێت، پێویستی هەبوو بەغەم ڕەوێنێك و هاوکۆڕێك بۆ ئەوەی وێنەی خۆی تێدا بەدی بکات، وەخۆی بخاتە باوەشیو، سکالآی ئازارو ئاواتەکانی لەلا دەردەبڕێت، وە بۆ ئەوەی نهێنی شان و باهووی بێت ڕازییە بە گوێ گرتن، بۆ خۆشی و ئارامی ژیان، تاوەکو لەسەری بژی و خۆی پێ چارەسەر بکاتو، برینەکانی ساڕێژ بکات.

مەولانا ڕووی نا بەرەو هۆنراوە هۆنینەوە -گەرخاوەنی قەریحە- بۆ دەربڕینی زانستە زۆرو بەر فراوانەکەی و-خاطیرة-ناسك و نیانەکانی، بۆ سووك کردن و کەم کردنەوەی ئازاری دەروونی بەتکاو پاڕانەوەکەی تێیدا.

شیعرو گۆرانی زاڵ بوون بەسەریدا نەیدەتوانی وازیان لێ بهێنێت بۆیە ئەم پارچە شیعرەی بە ئیعتیرازەوە ووتوە:

مەییان دامێ و ووتیان مەڵێ گۆرانی

گەر بەکێوی سولەیمانیانیان بدایە

نەی دەنۆشی هەر دەیوت گۆرانی

ئەم شعرەی کە هەڵقولاٚوی فەیزی خاطیرەیەو چۆڕاوەگەی دڵە بۆ ئەو بابەتە هەڵقولاٚوە کە شاعیر پێیەوە دەتلێتەوە، یان ئەوسەردەمە پێیەوە گیرۆدە بوون، ئەویش بەم جۆرە هۆنینەوەیە خەریك بوو کەشاعیر تێیدا جوانی شیعرو ناسکی دەربڕینو، شیرینی ئاوازو مۆسیقای کێش و سەروا" وزن و قافیە" و، چاکی ئەدەبی تێیدا بەکارهێناوە، بۆ دەرخستن و ڕوونکردنەوەی فەلسەفە قووڵ و بێ بنەکەی و، ماناو مەبەستە جوان و پڕ پێچ و پەناکانی، ئەو بیروباوەڕە بەرزەی کە هۆش و بیری خەریك کردووە و، دڵی دەخاتە حاڵی جۆش و خورپە، فەرموودەکانی زوو لە دەروونندا جێگیر دەبوون، وە زۆر شیرین و پڕ لەزەت بوون، بۆ دڵە تینووەکان، لەگەڵ پاراوی و ڕازاوەیی ووتەکانی، تێ گەیشتنیش لێی زۆرئاسان بوو، زۆر بەزووی جێی خۆی دەکردەوەو، لەناو جەرگەی کۆمەڵ و ئاداب و نەرێتی خەڵکیدا .. بەڵێ "حەکیمی سەنائی" یش هەروای نووسیوە لە "الحدیقە" داو "فەرەیدەددینی عەتتار"یش لە "منطق الطیر" دا ئەو کاریگەرێتیەی هەیان بوو ئەم

دووکتێبە، لەکتێبە فەلسەفە ووشکەکان و باسە عیلمیە ووردو درشتەکان، بەدەست نەکەوتن جا ئەم دوو کتێبەی کە ڕەواجیان هەبوو لەناو ئەدەبی فارسیداو، بەڵکو لەناو ئەدەبی ئیسلامەتیشدا، کە بوونە هاندەرو پاڵ پێوەنەرێك بۆ دانانی "مەسنەوی" کە پێشەواو نمونەیەکن بۆی، هەروەکو هاوڕێکەی "حسام الدین شلبی" بۆمان دەگێڕێتەوە:-

جا لەبەر ئەوەی ئەو چەرخەی کە جەلالەددینی تێدا بوو بە هەمیشەیی و هەموو کات خەریك بوون بەقسەزانی"علم الکلام"ەوە، ئەو حەقائیقانەی پەیوەندییان هەیە بە عەقائیدو باسی ئیلاهییەت و حەقائیقی غەیبەوە: وەکو "الالوهیە" و سیفاتەکانی و "النبوە" و ئەحکامەکانی و غەیب و، وەحی و، بەهەشت و ، دۆزەخ و، زۆری تریش لەم مەسەلانە، کە ببوونە سەر باسی بابەت و، ووت و ووێژ و، دەمەقاڵەی ئەو سەردەمەو، ببوونە گفتوگۆو، لێ ووردبوونەوەی ناو یانەوکۆڕەکان، وەدەروونیی خەڵکیش گومان و دوو دڵی ڕووی تێ کردبوون و،هەندێکجار نەفی ئەمانیش دەکرا، گەیشتبووە ڕادەیەك، لەمیانە زانستیەکانیشدا پەشێوی و سەر لێشێواوی پەیدا ببوو دەربارەی -عەقیدە- ئەم مەسەلانەیش بابەت و سەر باسی "مەسنەوی"بوون وە ئەو جەمسەرەیش بوو کە بە شوێنیدا دەگەڕاو لەدەوریدا دەسوڕایەوە.

بەڵێ مەولانا لەناو جەرگەی ئەشعەری و فێرگە فیکرییەکاندا بە تەواوەتی ژیا، جا لەپێش ئەوەی بگات بە "شەمس الدین" مامۆسایەکی بەرزو زانایەکی جەدەلی بوو، بەڵام پاش "جەزب کردنی بەجازیبەیەتی ڕەبانی"، لەووتەی ئەم و ئەو وازی هێناو، بەرز بووەوە تا گەیشتە حەقیقەتی حاڵ، وەلە دەنگ و باس بیستنەوە گەیشتە دیتن بەچاو، وەلە بابەتی ڕەونەقداری لەفزییەوە گەیشتە تێ گەیشتن لە مەعانی، ئەمجا سیحری ئەو زاراوەو پێناسانەی کە منطیق لەبارەیەوە دەدواو دەمەقاڵەی لێ پەیدا دەبوو، بەتاڵ بووەوە لای مەولانا، تا گەیشتە ناوەڕۆك و مەرام و ئامانجی بابەت و، ئاکامی گەیشتنی بەم شوێنی ئەو هەڵانەی بۆ دەرکەوت کە فەلسەفە قسەزانی بە بەڵگە دەیان هێنایەوە، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بەڵگانەش پشتیان دەبەست بەعەقڵ و، هەستیارەکان لەڕاڤەدان و نەفی کردن، زۆر باش زانی کەلەم بوارەدا تێشوویان زۆر کەمە، لێرەوە مەولانا دەستی کرد بە ڕەخنەگرتن و بەدرۆ خستنەوەی قسەزانی–علوم الکلام– و فەلسەفە.

## ڕەخنەی مەولانا دەربارەی پشت بەستن بە هەستیارەکان بۆ بڕیاردان لەسەر ڕاستی یەکانی ئایینی

لەسەردەمی مەولانا فەلسەفەوعەقڵکاری، بەئەندازەیەکی بێ سنوور پشتیان بە هەستیارە دەرەکیەکان بەستبوو، بۆ خۆ سەپاندن و سەلماندنی حەقایق. لەو سەردەمەدا پێنج هەستیارەکە دادەنران بە میزانی ڕاست و دروست، بۆ سەلماندنی هەموو جۆرە ڕاستی یەك، بەڵکو دادەنران بە باوەڕپێکراوترین و بەهێزترین سەرچاوە، بۆ بەدەست هێنانی زانستی ڕاستەقینەی پڕ یەقین، هەروەکو باسمان کرد لەوکاتەدا ڕۆشنبیرەکان زیاتر مەیلیان بەرەو ئەوە دەچوو کە هەموو ئەو شتانەی پێنج هەستیارەکە هەستی پێناکات و نەیەتە ژێر باری هەست کردنەوە، نەفی بکرێن، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەخێرایی ئینکاریان دەکردن ولە ددانپیانان و بڕیاردانیدا کەنارگیر دەبوون و خۆیان دەخستە لاوە ئەم بارە نالەبارەش نەزعەیەکی بڵاوبووی ئەو کاتەی فێرگە و دەمەقاڵەی ناو کۆڕو دانیشتنەکانیان بوو.

لەو سەردەمەدا موعتەزیلەکان و ئەوانەیش کە پاڕەوەی ئەوانیان گرتبووە بەر، گەورەترین بانگ کەر بوون بۆ ئەم فیکرەیەی ناوی دەنێن "هەستیاری".ئەم بڕیارانەیش کە لەو سەردەمەدا دەردەکران ببوونە هۆی کزی باوەڕکردن بەغەیب، وە لە ئەنجامی کاریگەرێتی ئەم پاڕەوانە باوەڕکردن بەو حەقائیقە غەیبیانەی شەرع هێناونی کزببوو لەگەڵ ئەوەی کە هەموو کاتێك کتێبە ئاسمانیەکان دوو پاتیان دەکەنەوە. جا مەولاناش لە مەسنەوییەکەیدا بەتوندی ڕەخنەی گرتووە لەو نەزعەیە و ئەوانەی پشتگیری دەکەن. وەلە جێگایەکدا دەڵێت هەستکاری پشت بەستنە بە هەستیارەکان بۆ بڕیاردان لەسەر ڕاستیەکانی ئاینی، کە موعتەزیلەکان بانگی بۆ دەکەن ئەوانەی کە بەندەی ژێربار خراوی ئەون، واخۆیان دەردەخەن کەلە ئەهلی سونەن، بەلاّم دەبێ ئەوە بزانن کە ئەهلی سوننە، واخۆیان بەند ناکەن بەم هەستیارانەوە و ئەوەندەیش خۆیانی پێوە خەریك ناکەن کە بگاتە پلەی پەرستن و ڕادەی مل کەچ کردنی کوێرانە بۆ هەستیارەکان.

بڕیاری مەولانا لەوەدایە کە دەڵێ لەپشتی ئەم هەستیارە دەرەکیانەدا هەستیاری ناواخنیش هەیە، هەروەکو چۆن ئاڵتون لەناو خۆڵدا وون بووەو دیار نیە، لەپاشان دەڵێت:" هەستیارە دەرەکیەکان خۆراك و قوتی لە بەدەنەوە وەردەگرێت، بەلاّم هەستیارە ناواخنیەکان قوت و خۆراکی لەدەروون و ڕۆحەوە

وەردەگرن قوتی یەکەمیان ئەو تاریکییەیە کە لاشەی لیَ بنیات نراوە، بەلاَم قوتی ئەوی تریان "هەستیارە ناواخنەکان" ئەو نورەیە کە ڕۆح و دلّەکانی لیَ بەدی هیَنراوە"

هەروەها مەولانا دەلّیَت :" بۆ نەفی کردنی شتیَك هەر ئەوەندە بەس نیە کە بەچاو نابینریَت و، بەهەستیارەکان هەستی پیَناکریَت و بەلّکو نادیارەکان بەهەمیشەیی شاراوەی ناو دیارەکانن و تیایدا پیَچراونەتەوە، هەروەکوچۆن ئەو کەلّکەی دەرمان هەیەتی تیَیدا شاراوەیە، جاریَکی تریش دەلّیَت" مونکر هەمیشە دەلّیَت: من هیچ نەبینم تەنها ڕووی دەرەوە نەبیَت، بەلاَم ڕووی دەرەوەش بەبەردەوامی حوکمی پیَچراوەو نادیار دەردەخات ئایا نابینیَت داوو دەرمانی بەکەلّك چۆن سوودو کاریگەریَتیەکەی تیا حەشاردراوە؟".

ئەمجارەش دەلّیَیت "ئەوانەی پشتیان بەستووە بەهەستیارە دەرەکیەکان و، هەر بەوەندەوە وەستاونو، وە ئینکاری جگە لەوان دەکەن، ئەوانە هەستیارە ناواخیەکانیان لەدەست چووەو ونیان کردووە، وەئەو هیَزو تواناو بەهیَزییەی خودای گەورە پیَی بەخشیوون لەدەستیان داوەو، بوون بەکویَریَکی چاو بەستراو و ناتوانن ڕیَ بکەن تەنها بەهۆی گۆچانەوە نەبیَت، یا یەکیَك دەستیان بگریَت، بەڕادەیەك کاریَکیان بەسەرهاتووە کە لەئاستی زۆر حەقائیق و ڕاستیە وورد بینیەکان کویَر بوون ".

## سنور و فەرمانی عەقلّ:

مەولانا هەربەوەندە نەوەستاوە لەڕەخنەگرتندا سەبارەت بە هەستیارە دەرەکیەکان و بڕیاری ئەوەی نەداوە تەنها هەستیارەکان پەك کەوتووکوڵەوارن لەگەیشتنی بەڕاستیەکانی غەیب، بەڵکو عەقڵیشی لەمەدا بەشدار کردووەو دەڵێت، کە عەقڵیش کوڵەوارو بێتوانایە لەگەیشتن بە ڕاستیەکانی جیهانی غەیب و زانستی پێغەمبەران چونکە هیچ بنەماو بنچینەیەکی بەدەستەوە نیە بۆ پێوانی ئەم جۆرە مەعلووماتانە، و بەهیچ جۆرێك ئاگای لەم جیهانە پان و بەرینە نیە جیهانی غەیب و جیهانی میتافیزیقا وێنەی ئەمەش وەکو کابرایەکە لەدایك بوون و ژیانی تەنها لە ئاوی سوێر بەسەر بردووە هیچ شتێك دەربارەی ئاوی شیرین و سازگار نازانێت، زۆر بەگاڵتەوە پێکردنەوە پێی دەڵێت: ئەی ئەو کەسەی کەلەناو خوێناودا دەژی چی دەربارەی ئاوی سازگار دەزانیت. ئەو عەقڵەی کە خۆی پیّ بەندی هەست پێکراوان و ژێر بێژی(منطیق) کردووەو ناوی دەبات بە "العقل الجزئی المحدود" (عەقڵێکی هەندەنکی کورت بڕ) بەرهەمی ئەم جۆرە عەقلانەش بریتی یە لە گومان دروست کردن و وڕێنەکردن، نیشتەجیّ کەیشی جیهانی تاریکیە، بەڵکو عەقڵێکە کە مایەی سەرشۆڕی عەقڵەو، بارە بەسەر عاقلآنەوە، بەڵکو نەزانی زۆر باشترە لەم جۆرە عەقلآنە،

واش بە چاکتر و باشتر دەزانێت کەمرۆڤ خۆی ڕزگار کات لەم دیلیەو، عاتیفەو دڵی بخاتەکار، ئەگەر چی خەڵکی بەشێت ناوی بەرن".

پاشان دەڵێت :" بۆماوەیەکی دوورو درێژ ئەم عەقڵەم تاقی کردەوە، کە جگە لەهەست پێکراو هیچی تر نابینێت عەقڵیش بە ڕووکەش نەبێت بەهیچی تر ناشکێت. کەچی خەڵکی بەم عەقڵە دەڵێن" عەقڵێکی حەکیمانەی دوور بین". هەرکەسێك وەکو من عەقڵی تاقی کردبێتەوە، هەروەکو منیش شۆڕش بەرپا دەکات دژی ئەم عەقڵە. لەبەر ئەوە زۆر بەگرنگی دەزانێت خۆبەرەڵا کردن لەکۆت و زنجیرو دەرچوون لەسنوری ئەم عەقڵە کورت برە".

جا ئەگەر ئەم عەقڵە بەس بوایە بۆ زانینی ڕاستیەکانی ئایینی، ئەوا فەخری ڕازی سەرۆکی قسەزانان بەگەورەترین پیاو چاك دەردەچوو، وەلەهەموو کەس زیاتر ڕۆدەچوو بەناو قولآیی وبنی دەریایی ئاینیدا، بەلأم مەسەلەکە لەمەدا نیە بەڵکو سەرکەوتن و بەرز بوونەوە لە حەقیقەتی ئاینیدا، بەوانە دەکرێت کە بەئیمان و یەقین تێروتەسەلن." ئەوانەن هاوەڵانی محمد "صلی اللە علیە وسلم" ، پاکترین دڵ و دەروونیان هەبوو، لەهەموو کەس زیاتر لەعیلمدا قوڵ بووبوونەوە وەلەهەموو کەس زیاتر، زۆر لەخۆکردن و تەکەلوفیان نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ جۆرە کتێبی پەندیاری(حیکمە)یان

نەخوێنـــدبوو، وە هـــیچ جـــۆرە ترســـێکی فەلسەفیـــشیان وەرنەگرتبوو.

## بەڵگە هینانەوەی فەلسەفەیی پێ یەکە لەتەختە دروستکراوە

مەولانا لەو باوەڕەدایە کە ئەو زانستانەی مرۆڤ دایهێناوە، و ئەو پەندیارانەی (حیکمە) کەدراونەتە پاڵ یۆنانیەکان هیچ زیاد ناکات لەمرۆڤ تەنها دوور کەوتنەوە نەبێت لەحەقائیق و بێ ئاگایی نەبێت لەکردگار هیچ کەڵکێك نابەخشێت تەنها دروستکردنی "نەزانیەکی ئاڵۆز" و لەخۆبایی بوون و سەرکەشی لە خۆ ڕازی نەبوون نەبێت، ئەوەش بەڵگە هێنانەوەی لەفزی و توێکڵی بێ ناوەڕۆك. وەهەرکەسێك سوورە لەسەر ئەوەی کە بە بەختەوەری بژی، بازوهدی هەبێت لەم جۆرە فەلسەفانە، کە خەڵکی لە نەزانیەوە ناوی ناوە حیکمەت، جا هەرفەلسەفەیەك داهێنراوی خەیاڵ بێت و ڕووناك نەبووبێتەوە بەنووری ذی الجلال ی پەروەردگار ئەوە دەبێتە هۆی گومان و دوو دڵی، وەدەبێتە ڕێگرێك لێمان بۆگەیشتن بە پەروەردگار، بەڵام ئەو حیکمەتانەی کەلە پێغەمبەرانەوە وەردەگیرێت، ئەو حیکمەتانەیە کەبەهەرکەسێك بدرێت خێرێکی زۆری دراوەتێ.

مەولانا لەو باوەڕەدایە کەبەڵگەی مەنتیقی و فەلسەفی و ڕێکخستنی پێشەکی و بەڵگە دانان و دەرهێنانی ئەنجام ڕێگایەکی دروستکراوەوە بەکەڵکی هەموو بابەتێك نایەت، وەدادی ئەوانە نادات کە ڕێی خوایان گرتۆتە بەر، ئەوە ڕێبازێکی کورت و تەسك برە، وەهەرکەسێك خووی پێوەگرت و پێوەی بەند بوو، لەسەری ژیا، وەکو ئەو کەسە وایە کە قاچێکی لەدار داتاشراوی هەیەو بەسەربەستی خۆی ناجوڵێتەوەو بەئاسانی ناچەمێتەوە، بۆیە ئەم ووتەیە کراوە بەپەند" قاچی پیاوی خاوەن منتیقی لەدار تاشراوە، وەقاچی لەدار تاشراویش پارچە تەختەیەکە کە نە نەرمی تێدایەوە نەتوانایشی هەیە":

دووبارە دەڵێت: ئەوانەی خەریکی لاسایی کردنەوەن وەکو تووتی فەیلەسوف و ژیربێژان دووبارە دەکەنەوەو دەیلێینەوە بەڵگە دەهێننەوە، تووتیەکی ووشکی مردوی بێگیانەو ژیانی تێدا نیەو چونکە لەدڵێکی مردووەوە دەردەچیْ، چۆن ووتەی مردوو کارتێکردنو بەرووبوومی دەبێت کەلەمردوویەکەوە دەرچووبێت

# عەقلی ئیمانی

جەلالەدین لەو باوەڕەدایە، عەقڵێکی ئیمانی هەیە کەئەوە مەشخەڵ و ڕێ پیشاندەری عەقڵی ئەم جەستەیە و، هەرئەوە ڕابەری ئەم عەقڵە هەندەکی و کورت بڕە ڕابەرە و پێشەوای لاشەیەو پێویستیەکانی جێبەجێ دەکات و، بەکاری دەهێنێ بۆ مەرامە ماددیەکان، وەهەروەها دەگونجێ ئەم عەقڵە ئیمانیە ناو بنرێت بە "عەقڵی عەقڵ چونکە عەقڵ بەنوری ئەو ڕێگا دەبڕێت و بە چاوی ئەو دەبینێت، وە ئەم عەقڵە ئیمانیە بەکەس نابەخشرێت تەنها بەخاوەن باوەڕان نەبێت، جا ئەگەر ئەم عەقڵە جەستەیەش ڕوو پەرەی زۆری ڕەش کردبێتەوە، ئەوا ئەم عەقڵە ئیمانیەش ئاسۆی ڕووناک کردۆتەوە، نوورەکەی بەسەر ڕۆح و دڵەکاندا بڵاو بۆتەوە.

عەقلی ئیمانی پاسەوانی کاروانی ژیانە، هەروەکو سەربازی پاسەوانی وولات، چۆن داد پەروەرانە حوکم دەکات و میزانی ڕاست دەخاتە کار وە بەرپەرچی زۆرداران دەداتەوەو، ستەم لێکراوان سەردەخات پارێزگاری ڕژێم دەکات، ئارەزووەکانی نەفسی سەرکەش و زۆردار ژێر بار دەخات و دای دەمرکێنێتەوە.

بەلأم عەقڵی جەستەیی تاوان و گوناهەکان دەڕازێنێتەوە، وەلە کاری بەرزو جوان ساردی دەکاتەوە، هەژاری بۆ خاوەنەکەی بە دەست دەهێنێ و کاروباری لاگران دەکات، بەلأم عەقڵی ئیمانی گرێ کوێرەی عەقڵی جەستە دەکاتەوە لەکاتی نالەباری و تەنگانەدا بە هاوارییەوە دێت، و قوفڵی داخراوی بۆ دەکاتەوە  وە کاروبارەی بۆی ڕەخساوە بەو پەڕی سوکی و ئاسانیەوە بۆی جێ ئەو دەکات و دەیهێنێتە دی "  فەیلەسوف هەمیشە باسی "المعقولات" ی بێ بایەخ دەکات، کە هیچ گرنگیەکی نیەو، لەو سنورە بەو لاوە تێ ناپەڕێت هیچی تر نازانێت، چونکە ئەو عەقڵە لە دەروازەوە نەچووە بەو دیوا، و جیهانی بەر فراوان و بەرینی نەناسیوە کە خوای گەورە چەندین شتی سەرسوڕهێنەر و گران بەهای تێیدا دروست کردووە، وە هەروەها عەقڵەکەیشی هێشتا ساوایەو نەگەیشتۆتە تەمەنی هەرزەیی(سن الرشد) وە خونچەی گوڵی فیکری هێشتا نە پشکووتووە".

## نەزانی بەنەفس و بیٚ ئاگایی لە ئامانجی ژیان

"فەیلەسوف عەقڵ و فکری زاڵ بوون بەسەریاو، هەروەکو گەشت کەرێکی ستەم کار پشتی کردۆتە ئامانجەکەی، تاوەکو لە گەشتەکەی بەردەوام بێت هەست بەدوورکەوتنەوە دەکات لە مەنزڵگاکەی و، بیٚ بەش دەبێت لە گەیشتنی بەو هیوایەی بۆی دەڕوات". فەیلەسوف شارەزاییەکی زۆری هەیە دەربارەی زانستی بوونەوەر، وەلە مەعلومات سامانێکی زۆری کۆکردۆتەوە، بەلاّم تا ئێستا نەزانە بەنەفسی خۆی، خاسیەتی هەریەکە لە "جوهر"و"عرظ" زۆرباش دەزانێت، بەلاّم لەناسینی نەفس و نرخی خۆیدا نەزانە. ئەو نرخ و بایەخی هەموو شتێك دەزانێت بەلاّم نرخی نەفسی خۆی نازانێت لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕۆحی زانست و جەوهەری زانین و ناوەڕۆکی حیکمەت ئەوەیە کە پیاو نرخ و بەهای خۆی بزانیٚ و، ئامانجی دروست بوونی چیە بیزانیٚ، و هەڵوێستی لەگەڵ بەدیهێنەری ئەم جیهانەو داهاتووی پاش مردنی دەبیٚ چۆن بێت".

## بانگەوازێك بەرەو حیكمەتی ئیمانی

پاش ئەم هەموو گلەیی كردن و ڕەخنە گرتنە بەم توندی و تیژییەوە زۆر بەدڵسۆزانە بانگی ئەو كەسانە دەكات كە خەریكن بە فەلسەفەو عیلمی كەلامەوە، بۆ دیراسەكردن و كەڵك وەرگرتن لە حیكمەتی ئیمانی بەپەرۆشەوە ئامۆژگاریان دەكات و دەڵێت: تاكەی خۆ خەریك كردن بەفەلسەفەی یۆنانی و حیكمەتی مادديیەوە؟ وازتان هێناوە لە "حیكمەتی ئیمان" كە بریتی یە لە وتەی پێغەمبەران و لەلای خەلیفەكان و زانا ڕەببانیەكانیش دەست دەكەون. دەست بكەن بەخوێندن و تێفكرین تێیدا". وە دەڵێن زانستی ڕاستەقینە پەیدا نابێت تەنها لەڕێی خاوێنكردنی دەروونەوە نەبێت، وە ئەگەر پەرەی دڵ خاوێن بووەوە، لەوزانستە نەخشكراوانەی پێشوو، ڕووناك بۆوە، ئەوا حیكمەتی ئیمانی تیایدا سەرهەڵدەداتو، زانستی پێغەمبەرانی تێدا دەردەكەوێت و كانیاوی حیكمەت لەسەر زوبانی هەڵ دەقوڵێت، پاشان دەڵێت:" خۆت ڕوت و بێ بەری بكە لە سیفاتەكانت تاوەكو دەروونت و حەقیقەتی خۆت ببینیت، ئەو كاتە لەكانگای دڵتا زانستی پێغەمبەران بەدی دەكەیت بەبێ كتێب و مامۆستاو ڕابەر، ئاوێنە تا وەكو زیاتر خاوێن و ڕوونتر بێتەوە، زیاتر نوور تیایدا دەدرەوشێتەوە، ئەگەر دەروازەی دەروونت كرایەوە ئەوە لەوێوە بەبێ هۆكار بێ پەردە نوری خوای گەورە دەچێتە ناوەوە.

## لێکۆڵینەوە قسەزانیەکان و شێوازی مەسنەوی تیایاندا

جەلالەدین هەر بەوەندەوە نەوەستاوە کە ڕەخنەی تێکڕایی بگرێت لە بیروڕای فەلسەفی و بەرنامەی علم الکلام ومل کەچی لەئاستی هەموو ڕووکەشی و سەرزاییەك بەوەش قایل نەبووە کە بە تەنها گرنگی بدات بەڕۆح و ویژدان و هەواڵ زانین بە هۆی هەستیارە ناواخنیەکانەوە، بەڵکو گەڕاوە بەشوێن بابەتەکانی ووتەو دۆزینەوەی گیروگرفتەکانی بەشێوازێکی ڕێك و پێك و نایاب، وە باسە گرنگەکانی بە شێوەیەکی  وا جوان خستۆتە ڕوو، کە دڵ بەئاسانی دەیگرێتە خۆی، وەخاوەن چێژی ڕاستەقینە زۆری پێخۆشە، وە گوێ گرو خوێنەر ڕاستە و خۆ دەزانن ئەوانەی کەلێی دەدوێت هەمووی بەڵگە نەویستن، وەڕاستیەکی ئاشکرای بێ تەم و مژن، کە هیچ جۆرە ئاڵۆزی و ووشکی و ڕوو گرژی تێدا بەدی ناکرێت، ئەو مەسەلانەی  کە فەلسەفە پێوەی ماندوو دەبێت وەکو ئەوە وایە کە بەرەو ئاسمان بەرز بێتەوە، بەچنگ هەوا بگرێت، لەهۆنراوەکانیاندا ئەمانەی زۆر بەڕوونی تێدا دەردەکەوێت. وە لەسەر ئەوە سوور نیە وەکو قسەزان و فەیلە سوفەکان کە دەبێت بەرامبەرەکەی بە قسەو بەڵگەی دوور درێژو هێنان و بردنێکی زۆر ببەزێنێت، وەبەشان و باڵیا هەڵدات و مەسەلەکە گەورە بکاتەوە بەڵکو سوور بوونی لەسەر ئەوەیە کە دڵی بەرامبەرەکەی بخاتە جۆش

و وای لێبکات قسەکانی وەربگرێت ولای موحەقەق بێت بە شێوەیەك وەك ڕازو نیازی خۆی بۆ دەرببڕێت، بۆیە مەسنەوی مەزن دادەنرێت بەسەرچاوەی ئیمانێکی نوێ و پێویست لەهەموو سەدەیەکدا، دڵی تەنگ بەخوێندنەوەی دەکرێتەوە، وە عەقڵی پەشۆکاو بەدیراسەکردنی ئارام دەگرێت، وەزۆربەی خوێنەرانی مەسنەوی چارەی گیرو گرفتەکانیانی تێدا بەدی دەکەن و شیفای دەردەکانیانی لێ دەردەهێنن، مەولانا لەم لایەنەوە دادەنرێت بەدامەزنێنەری زانستێکی نوێ وە ئەگەر ناچاریش بین بۆ بەکارهێنان زاراوەی فەلسەفە بۆ ئەم مەبەستە، ئەوا ئەو دادەنرێت بەدامەزنێنەری فەلسەفەیەکی نوێ، وە مەولانا لەم کارەیدا دادەنرێت بەپێشەوایەکی"موجتەهید" بەتەنها شوێنکەوتووی قورئانی پیرۆزەو، بۆ فیترەتی ڕاست و ڕەوانی نەبێت بۆ کەسی تر گوێ شل ناکات.

# خوای بەدیهێنەرو بەڵگەکانی بوونی

مەولانا لە بەڵگە هێنانەوەیدا بۆ سەلماندنی بوونی خـوای گـەورە ڕێـڕەوی فەلـسەفەو بەرنامـەی قـسە بـازی و دەمەتەقێ ی "الکلامیە" باوی ئەو سەردەمەی نەگرتبووە بەر، بەڵکو ڕێـڕەوی قورئـانی پـیرۆزی کردبـووە دەستووری ژیـانی، لەسـەر ئـەو بناغەیـەیی کەدروسـت کـراو بەڵگەیـە بـۆ بـوونی دروست کـەرێك، وەجـوڵێنراو بەڵگەیـە بـۆ بـوونی جوڵێنـەرێك، وەنمونـەی حەکیمانـەی جوان و قەشـەنگی هێناوەتـەوە بۆ ئـەم مەبەسـتەی و فیترەتـی ڕاسـت و ڕەوانـی مـرۆۋ دەخاتـە جووڵـەو، دەیگەیەنێتە ڕادەیەك کەلای مەحاڵ بێت بوونی هێنراو بە بونی بـەدی هێنـەرێك، وە جـوڵێنراو بـەبێ جوڵێنـەرێك، وەکـارتێکراو بـەبێ بـوونی کاریگـەرێك، جـا بـەو پـەڕی سـاکاری و متمانـەوە دەڵێـت: پێنوسـێك دەبینیـت بەسـەر کاغەزێکـدا دێـت و چـاوت لەدەستەکە نیە کە دەیجوڵێنێت، ئەسپێك دەبینیت لەکاتی تـاو داندایـەو سـوارەکەی نابینیـت، نیرێـك دەبینیـت دەرچـووەو کەوانەکەی لەچاو دیار نیە، خەڵکی دەبینیت بەلاّم بەدیهێنەر و ژیان بەخشەکەی نادیارەو بەچاو نابینرێت، بەلاّم ئایا جووڵان بەڵگە نیە بۆ بوونی جووڵینەر؟ وەهاژەی با بەڵگە نیە بۆ بوونی بـا، وە خـوڕەی ئـاو بەڵگـە نیـە بـۆ بـوونی ئـاو، لەکاتێکـدا کـە شـنەی بـا هـەڵ دەکـات و گـەلاّو چـڵ و پۆپـەکان دەشـەکێنەوە،

دەبێ ئەوەت لەیاد نەچێ کەیەکێك هەبێت ئەو بایە دەخاتە جوولە، چونکە لەگەڵ هەموو جوڵێنراوێکدا جوڵێنەرێك هەیە، ئەگەر ناتوانیت کارتێکەر بەدی بکەیت خۆ کوێرەوار نیت لەدیتنی کارتێکراو و شوێنەواری ئەو کارتێکەرە، لەشتێکی زیندوو دەبینیت جوولەی تیایەو دەژی، هەرچەندە ڕۆحیش بەدی نەکەیت بەڵام سەرچاوەی جوولە و ژیانە لە لەشی زیندوواندا، ئایا تیشکی نوور و ڕووناکی جیهان گەورەترین بەڵگە نیە بۆ بوونی خۆر؟".

گرنگی تەنها لەوەدا نیە کە ئەم بوونەوەرە هەیەو بەس، بەڵکو گرنگی لەوەدایە کە بەوپەڕی نیزام و ڕێك و پێکی دروست کراوەو، هەموو شتێك لەجێ ی شیاوی خۆی دانراوە، هەموو شتێك بە ڕێژەیەکی گونجاو دروستکراوە و دامەزرێنراوە، وە هەموو شتێك نیزامێکی نەخشەکراوی هەیە، بەهیچ جۆرێك لێی لانادات، لە ئاستێکدا سەرپێچی ناکات، وەهەر ئەستێرەیەك نیزامێکی تایبەتی خۆی هەیە، خۆرو مانگیش نیزامی خۆیان هەیە، با و هەوریش وەکو فیلی سەرکەش و ووشتری بەرەڵلا بێ نیزام نین. بەڵکو هەموویان مل کەچی چەند نیزام و ڕژێمێکی تایبەتین کە هەڕەمەکی و بەرەڵلایی و سەر پێچی کردنی تێدا بەدی ناکرێت "لَا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ

سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ"[12] "وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ"[13] ئەگەر ناتوانی فەرمانەکانی خودواوەندی گەورەو کاروباری ئاسمانی بەدوو چاوی خۆت ببینیت، چاوێك بگێڕە بەبوونەوەرو نیزامەکەی، وەخۆر و مانگ دوو نووری ژێر بار خراون بەهەمیشە لە سوڕانەوەدان، بەبێ وەستان و گوێ ڕایەڵن بەبێ سەرپێچی کردن، وە ئەستێرەکانیش جغزی تایبەتی و جێگای نەخشەکراوی خۆیان هەیە، هەورە بروسکەیش لەدەنگی ئاگر دەچێ و، هاتووچۆی ڕێك دەخاو فەرمانی بۆ دەردەکا، کە فلآنە دۆڵ و شیو و ناوچە ئاو بداتو، فلآنە ناوچە ئاو نەدات، وەهەر کاتێك بێ ئاگا بوو وریای دەکاتەوە".

[12] سورەتی یس ئایەتی (٤٠)

[13] سورەتی البقرە ئایەتی (١٦٤)

# هۆی هێنانه بوون

مەولانا ڕای وایه که خوداوەندی گەوره ئەو بونەوەرو دروست کراوانەی لەبەر سوودی خۆی نەهێناونەته بوون، بەڵکو بۆ کەڵکی مرۆڤ خۆی دروستی کردوون، بۆ ئەوەی هەموو هێز و توانا و بەهرەیەکی بخاته کارو بگاته کەماڵی تەواو، پاشان دەڵێت پێغەمبەران فەرموویانە: خوای گەوره دەفەرمووێ: مەبەستی من لەم دروست کردن و هێنانه بوونه چاکەو منەت کردنه بەسەر خەڵکیداو، بۆ کەڵك وەرگرتن لەمن و، نیعمەت و بەرو بوومەکانمە، چونکه دروستم نەکردوون بۆ ئەوەی کەڵکیان لێ وەربگرم و پێداویستی خۆمیان پێ جێ بەجێ بکەم، بەڵکو دروستم کردوون که فەیزێك بێت بۆ بوونەوەرو دەرخستنێك بێت بۆ "السخاء والجواد". که دوو سیفەتن له زاتی خوداوەند.

# پێغەمبەریێتی و پێغەمبەران

مەولانا دەڵێت پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) با خۆیان تاریفی خۆیان بکەن وەلەسەر زمانی ئەوان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئەوان دەڵێن "ئێمە پزیشکی گیانین و قوتابی پەروەردگارین دەریا بۆ ئێمە دوو لەت بووەو، کانی لەناو بەردا بۆمان هەڵ قوڵاوە، پزیشکی جەستە بە دەست لێدان و پزیشکی نەخۆشی دەناسن، بەڵام ئێمە بە نووری پەروەردگار سەیر دەکەین و بەسروشتی خوایی گفت دەکەین، ئەو پزیشکانە زانستیان دەربارەی خۆراك و بەروبوومەو، کەڵك و زیان و کاریگەریێتی خۆراك و دەرمان دەزانن لە جەستەی مرۆڤدا، بەڵام ئێمە پزیشکی قسەو کردارو بیروباوەڕو ڕەوشتین و، خەڵکی ئاگادار دەکەینەوە بە بوونی پاداشت و سزای کردەوەو ڕەوشت و، کاریگەری ئەمانە لەسەر ژیان و ئەنجامەکەی لە پاش مردن، وە دەڵێین ئەگەر هەڵسایت بە فڵانە کردەوە بەختەوەر و سەرفراز دەبیت، وە ئەگەر فڵانە کردەوەت نواند، ئەوا داماوو سەرگەردان دەبیت، فڵانە ڕەوشت دەوایەکی بە کەڵکە، وەفڵانە ڕەوشت ژەهرێکی کوشندەیە، وەفڵانە بیروباوەڕ هۆی ڕزگاری و بەختەوەریەو، فڵانە بیروباوەڕ تێکدەرو لەناو بەرە، دەلیلی پزیشکانی جەستە بۆن و ڕەنگ و تامە، بەڵام دەلیلی ئێمە فەرموودەی خوداوەند و ڕاگەیاندن و ئیلهامەکانیێتی".

## پێغەمبەر موعجیزەیەو خۆی بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرێتیەکەی

جەلالــەددین بەڵگــەی دەرەکــی و مــوعجیزەو بەڵگــەی قسەزانی "الکلامیه" ناهێنێنێتەوە بۆ سەلماندنی پێغەمبەرێتی پێغەمبەران، بەڵکو دەڵێت:"هەموو شتێك لە پێغەمبەراندا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەرێکی نێردراوە لەلایەن خودای گەورە، بەڵکو ژیان و خورەوشت و نەریت و هەڵس و کەوتی موعجیزەیەکی تەواوەو، بەڵگەیەکی ڕاستە لەسەر پێغەمبەرێتیەکەی، بۆیە کاتێ کە "عەبدوڵای کوڕی سەلام " کە زانایەکی جولەکەکان بوو" چاوی بە ناوچەوانی پێغەمبەر"صلی الله علیه وسلم " کەوت ، ووتی:" قەسەم بە خوا ئەم ناوچەوانە ناوچەوانی درۆزن نیە" هەر کەسێ عەقڵێکی ساغ و تەبیعەتێکی ڕاستی هەبێت، هەست بە ئیعجاز دەکات و ڕەنگی پێغەمبەر"صلی الله علیه وسلم"، لە پاش ئەمانە پێویست بەهیچ بەڵگەو سەلماندنێك ناکات".

## لە نێوان پێغەمبەر و ویژدانی نەوەکەیدا جۆرە بەیەك گەیشتنێك هەیە

مەولانا ڕای وایە  کە لەنێوان پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم ) و ویژدانی نەوەکەیدا جۆرە گونجانێکی شاراوەو، بەیەك گەیشتنێکی ڕۆحی هەیە، پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم " بەهەرچی چۆنێك گفتی کردبێت خێرا گوێ گرانی خاوەن ویژدانی ڕاست لەنەوەکەی بەڕاستیان زانیوە و پێشوازیان لێکردووە، وە بە بیستنی فەرموودەکانی هەڵقونیونەتەوەو لە خۆشیاندا  گۆرانیان بۆ وتوە، چونکە دەنگێکی پاك و بێ گومانەو، ئاوازێکی غەریبە کە بەهیچ جۆرێك لەچەشنی ئەم جۆرە ئاوازانە لەمەو پێش بەگوێیاندا نەچووە، چونکە هیچ جۆرە لەیەك چوونێك نیە لەنێوان دەنگی  ئەم پێغەمبەرەو، دەنگی هەموو خەڵکی و ئەو وێژەو فەلسەفەو زانستەی کە پێی ڕاهاتوون، وە دەڵێت: هەر  کاتێك پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" دەنگی بەرز کردەوە بۆ بانگ دان و هانای برد بەرەو پەروەردگار، ڕۆحی هەموو نەوەکەی خۆشی ڕوویان تێ دەکاو کڕنووشی بۆ دەبەن، چونکە ئەم جۆرە بانگە هیچ کەس لەمەو بەر گوێ ی لێ نەبووە، هەر  کە دەنگی ئەم ئاوازە غەریبە بەرز بۆوە هەموو بەختیار ناسێك بەخێرایی بەدەمیەوە دێن و دەڵێن:رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ

فَآمَنَّا(١٩٣)[14] پاشان دەڵێت: خاوەن باوەڕ پێویستی بە دەلیلی دەرەکی نیە بۆ سەلماندنی ڕاستگۆیی پێغەمبەر "صلی الله علیە وسلم ، ئەگەر هات ومیزاجی ساغ و تەبعی ڕاست بێت، چونکە دەلیل بۆ ئەم مەبەستە لە دەروونی گوێ گردایە، لەسەر ئەم بناغەیەش نیزامی ژیان پێك دێت، ئایا دەگونجێ یەکێکی تینوو بانگ بکەیت بۆ ئاو خواردنەوە و، پێت ووت ئەم پەرداخە ئاوی تێدایە، ئایا پێت دەڵێت بەڵگەت چیە؟ چۆن باوەڕت پێ بکەم؟ ئایا دەگونجێ دایکێکی میهرەبانی بەبەزەیی منداڵەکەی بانگ بکات بۆ ئەوەی شیری بداتێ، پێ ی بڵێ بەڵگەت چیە بۆ ڕاستی ئەم قسەیەت؟ تاکو لە شیرەکەت تێر بخۆم!! وە بوونی تینوویەتی لە دەروونی یەکێکی تینوودا بوونی برسێتی لەمنداڵێکی ساوادا، وە بوونی ئیخلاص لە دڵی بانگکەردا بەسە بۆ ڕاستیەك کە پێویستی بە هیچ جۆرە بەڵگەیەك نیە!".

مەولانا لەو باوەڕەدایە کە موعجیزە نابێتە هۆی دروست بوونی ئیمان.. چونکە بۆ دەم کوت کردن و بەزاندنی دوژمن و کۆڵەوار کردنی کەللە ڕەقانە، ئەوەی کە ئیمان دروست دەکات لە دلاًنداو، مرۆۆ دەخاتە ژێر باری گوێڕایەڵی و دروست کردنی خۆشەویستی بریتی یە لە یەکگرتن و گونجانی ڕۆحی چونکە

---

[14] سورە ال عمران ئایەتی ١٩٣

موعجیزه به زۆر سەپاندنەو، بەسەردا سەپێنراویش سنگی فراوان نابێت و دڵیشی ناکرێتەوە".

پاشان سیفاتو، ڕوخسارو، لێ هاتوویی و، بەجەرگی پێغەمبەران باس دەکات، بێ گومان دەبێ کەڵکیان لێ وەربگرێت لە ڕووی ئەدەب و ڕەوشتو ڕێزگرتنەوە، داوای چاکی گوێ گرتن بۆیانو، ڕوو وەرگێڕانی تەواو بەرەو ئەوان دەکات، عیزەتی نەفسو سەربەرزی و لێ هاتوویی پاشاو گەورەکانیا تێدایە، کاریان ئەوەیە ئەوان بدوێن و بەتێکڕا خەڵکی گوێ یان بۆ بگرن وە فەرمان دەرکەن و هەموو بۆیان گوێ ڕایەڵ بن، ئەوەی نەنگی هەبێت لە ئەدەب و ڕێزگرتن لە گەڵیاندا، ئەوە بێ بەش دەبێت لە کەڵك وەرگرتن لێ یان و لەناو دەچێت.

لەپاشان دەفەرمووێت:" چۆن ئەم مل کەچی و ڕێزگرتنە لێ یان بەسەیر دەزانرێت کەلە بەرزترین جێگاوە هاتوون و، پەیامەکەیان لە لایەن خودای پەروەردگارەوە هێناوە.

# حیكمەتی ڕۆژی قیامەت و زیندووبونەوە

تێڕوانیـی مـەولانا دەربـارەی ڕۆژی قیامـەت و زیندوبوونـەوە پێچەوانەی تـێ ڕوانینـی خەڵكیـە بەگشتی، مـەولانا ڕەش بین نیەو بە چاویلكەی ڕەشـەوە ناڕوانێتـە مردن، وە مـردن دانانێت بـە كۆتـایی هـاتنی ژیـانێكی بەختـەوەری بـەنرخی گـران بـەها، بـەڵكو بەپێـچەوانەوە دای دەنێـت بـە سـەرەتایی ژیـانێكی هەمیشەیی نەبڕاوەو، گوزەرانێكی پڕ لە بەختیاری و ڕەزامەندی و، سـەرەتایەكە بـەرەو پـێش كـەوتنی هەمیـشەیی و ژیـانێكی ڕازاوەی بـەردەوام، دوای ڕوخانـدن نـەبێت ئـاوەدان كردنـەوە ڕوونـادات، وە گەنجینـەو خەزنـەی گـران بـەها نادۆزێتـەوەو، دەرناهێنرێـت دوای هەڵكەنـدنی زەوی نـەبێت، وە ئەگـەر خانویـەكت بینـی دەی ڕوخێنن و تێكـی دەدەن، دەبـێ بزانیـت كەلە دوای ئەم كـارە نەخشەیەكی تازەترو كۆشكێكی نـوێ تـر دروست دەكرێت، هەروەها پەروەردگار لاشەكان تێك دەدات بۆ ئەوەی سەر لە نوێ چاكیان بكاتـەوەو وەلەسـەر شێوەیەكی تـر دروسـتی بكاتـەوە، وە ئـەم خانووە تێك دەدات بۆ ئـەوەی ئـەو خەزنـە شـاراوەیەی تیـا دەر بهێنێنیـت و بینایـەكی نـوێ ی لێ دروست كاتەوە. دارو درەخت تا گوڵ نەكاو، ئەو گوڵانەش هـەڵ نـەورێت بـەروو بوم نـادات بەهـەمان شێوە ڕۆحیش بـە گـوڕترو بـەهێز تـر نابێـت و بـەرگێكی نـوێ و قەشـەنگ لەبـەر ناكـات،

تاوەکو لاشەی فانی نەڕوخێنرێ و لانەبرێت و تەمەنی کاتیش هەڵ نەگیرێت، خوای پەروەردگر کە جواد مطلقة ئەو نیعمەتەی کە بەخشیویەتی هەڵی ناگرێت ئەگەر نیعمەتێکی چاکتر و زۆرتری پێ نەبەخشێت وە ئەم ژیانە لاوازو نەخۆشە هەڵ ناگیرێت کە شایستەی ئەوە نیە ناو بنرێت ژیانی نەبڕاوەو، هەتا هەتایی گەر بێتو ژیانێکی فراوانتر و تەمەن درێژترو جوان و ڕازاوەتر نە بەخشێت، هەرکەسێك بینی کە پەروەردگار یەکێك لە دۆستەکانی خۆی دەمرێنێت، دەبێ ئەوە بزانێت کە ئەو بەرگەی پێوەی ڕاهاتووە لەبەریا دای دەکەنێ وشتێکی تری وای پێ دەبەخشێت کە نەچاو بینیویەتی و، نەگوێ بیستویەتی و، نەبە خەیاڵی کەسیشدا هاتووە".

وە بەشێوەیەکی درێژ باسی دەکات و دەڵێت:" لە پێش هەموو دروست کردنێك دەبێت تێك دانێك هەبێت، وەلە پێش هەموو نوسینێك دەبێت کوژانەوەیەك بێت، نوسەرێك کاتێ دەیەوێت لەسەر پەڕەیەك بنوسێت ئەوا دەبێت ئەو نەخش و نوسراوانەی پێشوو بسڕێتەوە، وە ئەگەر مرۆڤ بیەوێت ئاو دەربهێنێت ئەوا دەبێت زەویەکە هەڵ کەنێت، وە ئەگەر جوتیار بیەوێت کشتوکاڵ بچێنێت دەبێت زەویەك هەڵ بژێرێت کە هیچ جۆرە چێنراوو، ڕووەکێکی تێدا نەبێت، هەر کاتێك هەر شتێك

که سیفەتی فنای زیاتر تیابێت ئەوا سڕینەوەی ئاسانترەو، نوسینەکەی تەمەنی زۆرترەو درێژترە".

بەو پەڕی ڕەوان بێژی و حیکمەتەوە دەڵێت:

" تاوەکو هەژاری زیاتر بێت ئەوا بە دەست هێنانی سیفەتی خاوەنی دڵ و فراوانی زیاتر دەبێت، وە دەوڵەمەند و سەخیەکان دڵیان زیاتر نەرم دەبێت و دەکەوێتە جۆش بۆ ئەو هەژارانەی بێ دەرامەتن".

# ڕەوا نیە لە مردن بترسین

مەولانا دەڵێت :" لەبەر چیە ترسمان لە مردن؟ بۆچی ئەم ڕاکردنە لە مردن ؟ تۆ بەبەردەوامی لە جولاّنداى لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر، وەلە نەبوونەوە بۆ بوون، وەلە بوونەوە بۆ نەبوون هەروەها بەبەردەوامی لەبەرگ داکەندن و لەبەرکردنی بەرگێکی تر، هەتاوەکو لەو چوار توخمەوە گەیشتبێتە قاڵبی مرۆڤایەتی، وە ئەگەر خۆت گیر بکردایە بە بارێکەوە، دەستت پێوە بگرتایە، وەسور بویتایە لەسەر ئەوەی کە لەو بارەدا بمێنیتەوە و ڕازی نەبویتایە کە بچیتە بارێکی ترەوە، ئەوا هەر لەسەرەتایدا دەمایتەوە نەدەگەیشتیتە چڵە پۆپەی مرۆڤایەتی و لوتکەی کەماڵاتی زانستی و ڕۆحانیەت، ئایا تەنها لە ڕێگای فەناوە، مانەوە"بەقا"ت دەست ناکەوێت؟ جا بۆ ڕادەکەیت لە فەنایەکی نوێ کە پێشەکیەکە بۆ بەقای نوێتر، بۆ خۆت گیر کردووە بەم ژیانە بڕاوەیەو پێوەی نوساوی، سەرەڕای ئەوەی کە ژیانێکت بۆ بەجێ دەهێڵێ کە نەبڕانەوەی تێدایەو نەترس و خەم و پەژارەی تێدایە؟!".

پاشان دەڵێت:" ئایا لەم ژیانی دونیایەدا مردنت تاقی کردۆتەوە؟! کە ئەگەر مرۆڤ لەم ژیانە جیا بۆوە ژیانێکی نەمری بەدەست دەهێنێت و بەهیچ جۆرێك مردن نابینێت؟".

وه دەڵێت :" لێرەدا جیاوازی هەیە لە نێوان مردن و مردنێکی ترمردنی پیاو چاکان(العارفون) ناپێورێت بە مردنی نەفامان و تێکڕایی خەڵکی، پیاوچاکان بۆ جیا بوونەوەیان لەم ژیانە بڕاوەیە، نە ئازار دەچێژن وە نەخەم و پەژارەش دایان دەگرێت، بەڵکو بەو پەڕی دڵ خۆشی و ڕوو گەشیەوە پێشوازی لە مردن دەکەن، مردن لەلای ئەوان دروست بونی ژیانێکی نویّ یە، پەیامی سەرکەوتن و ڕزگاربوونە، ئەو ڕەشەبایەی خوای گەورە ناردییە سەر گەلی هود، دۆزەخ و سوتێنەر بوو بۆ بیّ باوەڕەکان، هەروەها مردن بۆ بیّ باوەڕەکان ژەهرو بەڵایە وەبیّ بەشی و سەرزەنیشتی و لەناو چوونە، بەڵام بۆ خاوەن باوەڕەکان شنەبای چارەسەری دەردەدارانە و هەوایەکی شێدارو پڕ لە گوڵاوە.

## زۆرەکاتی و خوایشکارەتی یان پەسەندکارەتی

## الجبرو والاختیار

جەبروئیختیار لەمەسەلە هەرە گرنگ و ئاڵۆزەکانی ئەو سەردەمە بوو، کە بۆشاییەکی زۆری کتێبەکانی قسەزانی گرتبۆوە، کۆمەڵێکیان بیروڕایان گەیشتبووە ڕادەیەك کە نەفی" الاختیار المطلق"[١٥] یان دەکردو بوونی "الجبرالمحص"[١٦] یان دەسەلماند، وە لە ناو مێژووی کۆمەڵ و میللەتاندا ناونراون بە "الجبریە"، وە جەلالەددین بە شێوەیەکی ماقوڵانە، بە ڕوونی بەرپەرچی دەدانەوەو دەیفەرموو:

" ئەگەر جەبری موتڵەق ببوایە، هیچ کاتێك "الامر و نهی" ئەوە بکەو ئەوە مەکە دەر نەدەکرا بۆ مرۆڤ ، وە بەشەرع و ئەحکام تەکلیف نەدەکرا، ئایا شتی وا بووە مرۆڤێك بە بەردێك بڵێ ئەمە بکەو ئەمە مەکە ، پاشان دەڵێت:" قورئانی پیرۆز پڕیەتی لەفەرمان کردن و، نەهی کردن و ترساندن وە نەمان بیستووە کە خاوەن هۆشێك ئەمر بکات بەسەر خۆڵدا، یان نەهی بکات لە ئاسن". باوەڕی"الاختیار" لەلایەن مرۆڤ و گیان لەبەرانەوە

---

[١٥] هەموو شتێك بە ئارەزووی خۆی دەکات و خوای گەورە پەیوەندی پێوە نیە

[١٦] ئادەمیزاد هەموو کردارێك و ڕووداوێك بەزۆر بەسەریدا سەپێنراوە بێ ئەوەی دەستی تێدا بێت.

مەولانا دەڵێت : سروشتی مرۆڤ لەسەر بیروباوەڕی ئیختیاری پێك هێنراوە، وە خۆی لە ژیانی ڕۆژانەیدا ئەم عەقیدەیە دەهێنێتەدی و، جیٚ بەجیٚ ی دەکات بەهەڵس و کەوت و کردەوەکانی قەراری ئەم جۆرە ئیختیاریە دەدات و، ئینکاری "الجبریه" دەکات، سزای بیٚ گیان نادات، وە تووڕە نابێت لەدارو بەرد و ئاگرو ئاوو هەوا، هەرچەندە ئازارو ئەشکەنجەی لەلایەن ئەم شتانەوە تووش بێت، پاشان پرسیار دەکات "ئەگەر لە بنمیچیماڵەکەتانەوە پارچە دارێك بەسەرتا کەوتە خوارەوە، بزینداری کردیت، و خوێنت لەبەر ڕۆیشت، ئایا لەو کەرتە دارە توڕە دەبیت؟ وە ئایا گلەیی لیٚ دەکەیت و، هەروەها ئەگەر ئاوو لافاوێك هات و هەرچی شت و مەکت هەیە هەمووی سەر ئاو خست، و تەڕی کردوو لەگەڵ خۆیا بردی، وە یان هەوایەك هەڵی کردو سەرمێزەرەکەی فڕاندی، ئایا توڕە دەبیت لەو ئاو و هەوایەو، ڕوی گلەیی تیٚ دەکەیت و سزای دەدەیت؟

بەڵاّم ئەگەر کەسێك ویستی سەر زەنیشتت بکات و شەرەف و ناموست بەرێت، ئەوە خێرا شالاّوی بۆ دەبەیت و سزایەکی توندی دەدەیت، بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە جیاوازی دەکەیت لە نێوان (المجبور والموختار_زۆر کارو پەسەند کار) وە باوەڕت وایە کە مرۆڤ خاوەن ئیختیار و ویستی خۆیەتی و، لیٚ ی دەپرسیتەوەو گلەیی لیٚ دەکەیت، سزای دەدەیت و، شکاتی لیٚ

دەکەیت، لۆمەی دەکەیت و، عوزریشی لێ وەرناگەیت چونکە (مخیر)ە[١٧]، نەك (مجبور) بێت".

جەلالەددین بەمەندەوە ناوەستێت بەڵکو بڕیاری ئەوە دەدات کە گیان لەبەریش ئەمە دەزانن، جیاوازی دەکەن لە نێوان (المجبور والمختار) فیترەتی ئەوەی پێ نیشان دەدات، ئەگەر بەردێکت گرتە سەگێك هێرشت بۆ دێنێت و پەلامارت دەدات، نەك پەلاماری بەردەکە بدات و تۆڵەی لێ بکاتەوە.

شەرمەزاری بۆ تۆ ئەی مرۆڤ کە جەبریەت دەدەیتە پاڵ مرۆڤ، کەچی گیاندارێکی بێ عەقڵ پێشت کەوتووە لە تێ گەیشتن و زانینی ئەم حەقیقەتە.

وە دەڵێت:" مرۆڤ ئەم ڕاستیە دەزانێت بەڵام خۆی لێ گێل دەکات لەپێناوی هەوەس و بەرژەوەندی خۆی، هەروەك ڕۆژانێك وایە کە سوور دەزانێت ڕۆژ بۆتەوەو، بەیانیە بەڵام ڕووی خۆی لەو ڕوناکیە وەردەگێڕێت و دەرگا لەسەر خۆی دادەخاو بەردەوام دەبێت لەسەر خواردن و خواردنەوە.

---

[١٧] بە ئارەزووی خۆی بووە نەك بە زۆر پێ ی کرابێ

## بنۆس و بنوسیار "العله والمعلول"

کۆمەڵە ئیسلامیەکان، کەوتبونە گێژاوی مەسەلەی هۆکان و بنوسەکان بە شێوەیەکی زیادە ڕەوی ڕێبازی حەکیمەکان وابوو، لە گەردوون مل کەچیەکی تەواوی هەیە، بۆ زنجیرەی بنۆس و بنوسیار (العله والمعلول) وەبنوسیاری بەهیچ جۆرێك لانادات لە بنوس، و (المسبب-هەر شتێك کە دروست دەبێت) جیا نابێتەوە لە هۆکەی (السبب) موعتەزیلەکانیش لەگەڵ ئەم ڕایەدا بوون. ئەگەر بڕیاری عیللەتی شتێکیان داو، یان ڕایان وابوو دەربارەی خاسیەت و کاریگەرێتی لەشتێکدایە، زۆر بەتوندی بەم بیرو ڕایانەوە دەنوسێن، و لایان وایە پێچەوانەی ئەمەیش مەگەر بەدەگمەن ڕووبدات. لەبەر ئەوە دەیان بینی زۆر بەدووری دەزانن، ڕوودانی شتێك بەپێچەوانەی خاسیەتەکەیەوە بێت و بەبێ هۆ ڕووبدات. وە هەوڵ و تەقەلا دەدەن بۆ هۆ هێنانەوەی ئەو شتانەی کە لە قورئان و حەدیسدا هەیەو، وە گوێزانەوەی تەواترەکەی لە موعجیزەو خاریقەوە بۆ هۆی ئاسایی و، عللەتی-بنوسی- سروشتی، ئەگەر لەم کارەیاندا سەرنەکەوتن ئەمەیش مەگەر بەدەەگمەن ڕووبدات، بەناچاری دان دەنێن بەوەی کە موعجیزەیە.

بەڵام ئەشعەرییەکان لەسەرێکی ترەوە بە پێچەوانەی موعتەزیلەکانن، ڕایان وایە کە هیچ شتێك عیللەتی-بنۆسی-

شتێکی تر نیه، وه نەخاسیەت و نه کاریگەریشی  هەیه له هیچ شتێکدا  ئەم زیاده ڕەویەش  بووه هۆی زیان بەخشین و ئاژاوه نانەوه، وای لێ هات هەر  کەس بەئارەزووی  خۆی، چی بویستایه  دەیووت وەچی نەویستایه ئینکاری دەکرد، وه زۆربەی  خەڵك لەم ڕێگەیەوه کەوتنه  ئینکاری کردن  و ڕەفز کردنی هۆکان وه بووبونه هۆی بێ ئیشی و تەمەڵی.

**هۆکان حەقیقەته : بەلاَم بەدیهێنەرەکەی نەله کار کەوتوومو نەوازیشی هێناوه**

بەلاَم ڕێبازی شێخ جەلالەددین مام ناوەند بوو له چاو دوو ڕێبازەکـەی تـر، ڕای وایـه کـه هۆکـان حەقیقەتـه، و(بنـۆس و بنوسیاری) و( الاسباب والمسببيات)- هۆو ئەوەیشی بۆته هـۆی دروست بوون بەیەکەوه بەستراون  وه ئینکارکردنی  ئەمـەیش بەهیچ جۆرێك  لـه پەسـەندی و  هۆش مەندییـەوه نیـه، ونـەش گونجـاوه، سـوننەتی خـوای گـەورەش هـەروا بـووه کـه هەمیشه دروســت کراوەکـان شـوێن  کـەوتووی هۆکـانێتی وه لەهــەموو شـتێکدا خاسـیەتی تایبـەتی  خـۆی دەرخستووه، بەلاَم خـەرقی عـادەت-لادان لـه سروشــت- شـتێکی گونجـاوەو ڕوو دەدات، دروســت کــردن و بــه دیهێنــانی (بنــوس و هۆکــان- العلــل

والاسباب) نه بوونەتە هۆی نەمانی کاریگەرێتی قودرەت و کاری کردگار، وە هەر ئەوە پەروەردگاری (هۆکان و خاوەن توانستی رەهایە، وەهەر کاتێك بیەوێت(دروست کراوەکان بەجێ دەهێڵێت بۆ ئەوەی پەیوەست بێت بە هۆکانیەوە، و شوێن کەوتووی یاساکە (نامووس)ی و بنوسەکە (علە)ی بێت بەم جۆرەیشیان زیاترو باوترە، وە هەر کاتێکیش بیەوێت لە هۆکەی دەری دەهێنێ و بە بێ هۆیەك یان بە پێچەوانەی هۆکەیەوە دروستی دەکات، ئەمەیە کە پێ ی دەڵێن(خارق العادە) وە دەڵێت :-

زۆربەی بارو رووداوەکان لەسەر سونەتی خوای گەورە دەرۆن بەرێوە هەر بە قودرەت و مەشیئەتی خۆی (هەندێك جار) لەم سونەتانە دەردەچێت بۆ پێغەمبەران و پیاو چاکانی، جا کە دەبینین هۆکان زۆربەی کات کاریگەرو لە کاردان، نابێت باوەرمان وابێت کە قودرەتی خوای گەورە پەکی کەوتووەو بێ هێزەو، ویستی خوای گەورە وەستاوەو لەکارکەوتووەو ناتوانێ دروست کراوەکان لە هۆکانی و، (المعلول-بنوسیاری) لە (عللها-بنوسەکەی) جیا بکاتەوە.

## هۆ شاراوەکان و هۆسەرەکیەکان

هۆکــان هــەر ئــەوەنین کــە ناســیومانن، و تاقیمــان کردونەتەوە، و لەبەر چاومانن و هەستمان پیٚ کردوون، بەڵکو زۆر هۆی تر هەیە کە شاراوەن و لەبەر چاومان نین و نایان بینین، وە ئەم هۆ ناوەکیەش، هۆو بزوێنەری هۆ دەرەکیەکانن هەر وەکو چۆن ئەم هۆی دەرەکی یە هۆو بزوێنەری دروستکراوەکانیەتی ئەم هۆ دەرەکیانە دەبزوێنیٚ و دەیان خاتە کارو، دەتوانێت بیان وەستێنێت و لە کاریان بخات مرۆڤ ئەم هۆ دەرەکیانی بە ئاسانی هەست پیٚ دەکات، بەڵام زۆرجار لە هۆ ناوەکیەکان بیٚ ئاگایە، بۆ نمونە گەر تێبینی بکرێت لەکاتی لەیەك دانی بەردە چەرخ ئەو ئاگرە چەرخەکەیە، هۆ ناوەکیەکەیەتی نازانرێت. هۆی سەرەکی ڕەسەن و ڕاستە قینە، فەرمان و ویستی خوای پەروەردگارە کەلە سەرووی هەموو هۆکانەوەیە، سەرچاوەی هەموو ڕووداوێکە "إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ"[١٨] هۆ شاراوەکان لای پێغەمبەران ڕوونەو، بە ئاشکرا دەیبینین، وەکو چۆن ئێمە هۆ دەرەکیەکان لامان ڕوون و ئاشکرایە، لە پاشاباوەڕیان وایە کە ئەو هۆڕاستەقینەیەی کە بریتی یە لە

---

[١٨] سورەتی یس ئایەتی ٨٢

ویست و ئیرادەی خوای گەورە هەر ئەوە کە هەموو هۆو بنوسێکی تر لەوێدا دەبڕێتەوەو سەرچاوەی هەموو ڕووداوو کردارێکە. ئەوان ئەو دەسەڵاتەی خوای گەورە دەبینن کە دەست دەخاتە ناو بوونەوەرەوە، هەر چۆنێك بیەوێ هەڵیان دەسوڕێنێت و فەرمان ڕەوایی لەم جیهانەدا دەکات و ئەم دەسەڵاتەی لەسەروو هەموو دەسەڵات و یاسایەکی ترەوەیە، وە هەر ئەو دەسەڵاتەیە کە نیزامی گەردوون پی ملکەچە، وە هەر ئەو دەسەڵاتەیە کە خاسیەتی تایبەتی لەشتدا دروست دەکات، وەهەر کاتێکیش بیەوێت ئەو خاسیەتەی لێ دەردەهێنرێت، وە دەتوانێت کە سروشتی شت بگۆڕێت، وە وا بکات لە ئاگر کە ببێت بە (بردا وسلاما).

وە ئەوان ئەو هۆ دەرەکیانە زۆر بەبچوك و لاواز و بێ نرخ دەبینن لەچاو هۆ ناوەکیەکان، هەروەها هۆ ناوەکیەکان زۆر بچوك و بێ نرخ و لاواز دەبینن لەچاو هۆ ڕاستەقینە کە ویستی پەروەردگار.

"وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ"[١٩]

---

[١٩] سورەتی انعام ئایەتی ٧٥

## هۆ پەرستی و بەرەنگاری کردنی لەلایەن پێغەمبەرانەوە

خەڵکی کورت بین زۆرجار زیادە ڕەوی دەکەن لە پەرستنی هۆ لە ئەنجامی نەزانی و کارتێکردنی ماددیەت، وە باوەڕیان زۆر بەهێزە بە کاریگەری هۆو خۆبەندکردن پێیەوەو، خۆ خەریك کردن تیایدا وە هۆکار دەکەنە هاوەڵی خوای گەورە. وە خۆیان گێل دەکەن لەدروست کەری هەموو هۆیەك، وکردگاری هەموو شتێك، و خۆیان خەریك دەکەن بە پەرستنی ڕووکەش و ڕووخسارەوە لەم کاتەدا پێغەمبەران هەڵ دەستن بەبەرەنگاری بوونی ئەم جۆرە (بت پەرستیە– هۆپەرستی)، خەڵکی بانگ دەکەن لە هۆوە(الاسباب) بەرەو بەدیهێنەری هۆ (المسبب) خوداوەندی بە دەسەلأتیش بۆ ئاگاداری و فێرکردن لە سەر دەستیان چەند ڕووداوێك بەدی دەهێنێت کە دژی یاساکانی سروشتن، بۆ ئەوەی لە لایەکەوە لاوازیی و بێدەسەلأتی هۆکان و لەلایەکی تریشەوە قودرەتی ڕەهای خوای گەورەو سەربەستی وویست وئیرادەی و مەشیئەتی زاڵ بووی دەرخات، چونکە هەر ئەو زاتەیە خاوەنی بوونەوەرو هەر بە دەستی ئەوە مەلەکوتی هەموو شتێك، وەهەر ئەوە خاوەن توانست بەسەر هەموو شتێکداو هیچ پێویستیەکی بە هۆ نیە و پێیەوە بەند نیە، چونکە دەبینین دەریا یان بۆ دوو لەت دەبێت و، ڕووباریان بۆ هەڵ دەقوڵێت بە بێ هیچ جۆرە

هۆیەك لە هۆیەك لە هۆ ئاساییەکان، وە ڕووەك و کێڵگەیان بۆ پەیدا دەبێت بەبێ کێڵاَن و چاندن، وەلم دەبێت بە ئاردو، خوری دەبێت بە ئاوریشم و، کۆمەڵێکی کەم سەر دەکەوێت بەسەر کۆمەڵێکی زۆرداو، هەژاری لاواز، دەوڵەمەند دەکاو، دەوڵەمەندی بەهێز، هەژارو ئاوارە دەکات تەنها بەفەرمانی خوای گەورە دەفەرموێت:"وَأَوْرَثْنَا الْقَوْمَ الَّذِينَ كَانُوا يُسْتَضْعَفُونَ مَشَارِقَ الْأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ الْحُسْنَى عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ بِمَا صَبَرُوا وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُ وَمَا كَانُوا يَعْرِشُونَ"(١٣٧) [٢٠] "كَمْ تَرَكُوا مِنْ جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ (٢٥) وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ (٢٦) وَنَعْمَةٍ كَانُوا فِيهَا فَاكِهِينَ (٢٧) كَذَلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا قَوْمًا آخَرِينَ (٢٨)"[٢١]

---

[٢٠] سورە اعراف ١٣٧

[٢١] سورەتی الدخان ٢٥،٢٦،٢٧،٢٨

## نە ڕەهبانیەت و نە بێ کاری؛

مەولانا لەم ڕووەوە زۆر ڕۆناچێت و زیادەی ڕەوی ناکات، وەکو زۆر لە صۆفیەکان و ئەشعەرییەکان زیادە ڕەوی تیا دەکەن بە جۆرێك، ئینکاری بوونی هۆکان دەکەن، و داوای ڕفز کردن و وازهێنانی دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا ڕەفزی جۆرە(توکل)ێك دەکات کەببێتە هۆی ڕەبەنی و بێ کاریو پاڵدانە بەڵکو دەڵێت : "سونەتی ژیان و عادەتی باو بریتی یە لە بوونی دروستکراو بە هۆی هۆکانەوە" تاکو ئیشکەر گرنگی هەوڵ و تێکۆشان بزانێت، وە لە دەرگاکانەوە بێتە ماڵەکانەوە، و هەموو شتێك لە مەعدەنەکەی خۆی داوابکات بەڵکو بەرەنگاری بێ کاری و لەکارکەوتن و، ڕەهبانیەت و (توکل)ێکی سلبی دەکات کە پەك کەوتەو لاوازەکان، لەم سەردانەی دواییدا پەنایان بۆ بردووە، وەبەو پەڕی هێزو تواناییەوە، باگەوازی تێکۆشان و خۆ ماندوو کردن دەکات، وە ڕەچاو کردنی هۆکانی گوزەران و، داوای ژیانێکی کۆمەڵایەتیانەی بەختەوەر دەکات و دەڵێت:-

"گەر بێتو ژیانی کۆمەڵایەتی لەلای ئیسلام پێویست نەکرایەو پەسەند نەبوایە، ئەمری نەدەکرد بە جومعەو جەماعەت، و ئەمری نەدەکرد بەچاکەو، نەهی نەدەکرد لە خراپە". وە ئەو جۆە (توکل) پشت بەستنەی کە بەلای ئیسلامەوە پەسەند بێت

و، بەباشی دەزانێت بریتی یە  لە خۆئامادەکردن و، دەست گرتن بە (الاحتیاط) سپێری پێویست و، ئەمجا پشت  بەستن بە خوای گەورەو، تەفسیر کردنی  فەرموودەکەی  پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم  "اعقلها وتوکل علی الله".

**بانگەوازێك بۆ هەوڵ و تێکۆشان:**

جەلالەددین خەڵکی  هان دەدا بۆ کارکردن و تێکۆشان هاتووە  ووت و وێژێك بە زمانی گیانداران دەگێڕێتەوە، لە بابەت (توکل) و ئیش کردنەوە، وە باشترین بەڵگەی  پێویست بوونی ئیش کردن و هەوڵدانی باسکردووە لەسەر زمانی شێرەوە و دەڵێ:"پەروەردگار ئەندام ودەست و قاچ و بەهرەو ووزەی زۆر بە  ئادەمیزاد بەخشیوە، ئەمەیش بەڵگەیە بۆ ئەوەی  کە داوای کارکردن و  هەوڵدانیان لێ دەکات، هەروەکو چۆن ئاغایەك  هەرکاتێ  تەورو پاچەکەی  دا بەکۆیلەکەی ئاشکرایە کە داوای  هەڵ کەندنی  چاڵ یان  شکاندنی  بەردی لێ دەکات. ئەگەر چی گفت بەو داوایە بکات یان نەیکات،  هەر بەوچەشنە کاتێ کردگار  ئەو دەستە ئیش کەرەو  ئەو بازووە بەهێزەو ئەو  پێیە  بەکارەو ئەو  هەموو ووزە  زۆرەی پێ بەخشیوین، بێ گومان بەڵگەی ناوێت  کە داوای  کارکردنمان لێ دەکات و هێزمان بخەینە کار، وەلە ژیاندا هەوڵ بدەین و تێبکۆشین وە ڕۆزی خۆمان بە دەست بهێنین بە  هێزی  بازوو،

ئارەقی ناو چەوان، وە (توکل)ی ڕاستەقینە ئەوەیە کە درێغی نەکەین لە تێکۆشانماندا، ئەمجا پشت ببەستین بە خوای گەورە، تێکۆشان شوکرانەی نیعمەتەو، پاڵ دانەوەو تەمەڵی[22] کوفرانەی ئەو نیعمەتەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: "لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ"[23] کار بکەو ئارەقی ناوچەوان بڕێژە ، ئەمجا پشت ببەستە بە ڕۆزی دەری خاوەن هێزو توانا.

## دنیایی زەمکراو کامەیە؛

جەلالەدین لەسەر زمانی شێرەکەوە دەگێڕێتەوە: کارکردن و تێکۆشان سوننەتی پێغەمبەران و نێراوانی خوایە، دنیاش تەنها زێڕو زیوو ماڵ و مناڵ نیە، وەك هەندێك لەزیادەڕەوانی سۆفیەت لێی تێگەیشتوون بەڵکو دونیایی زەمکراو ئەو دونیایەیە کە غافڵ بوونی خوای گەورەی تێدا بێت، ئایا پێغەمبەر صلی لله و علیەو سلم نا فەرموویێت" نعم المال الصالح للعبد الصالح".

---

[22] مەزهەبی جەبرییەکانە.

[23] ئایەتی (٧) سورەتی ابراهیم

## بێ کاری پیاوچاکان ڕێگە خۆشکەرەیە بۆ فاسق و ستەم کاران:

مەولانا دەڵێت بێ کاری و ئیش نەکردنی پیاو چاکان لەگەڵ (توکل)ێکی نەفامانەی وا کە لەگەڵ حەقیقەتی ئیسلام ناگونجێت، بوونە هۆی ڕێ خۆش کردن بۆ خراپ کاران و، ستەم کاران و، کاربەدەستانی بێ هۆش و، هیچ نەزان، کە بونە هۆی خوێن ڕشتنی زۆر بێ تاوان و کوشتنی زۆر لە زاناو ڕۆشنبیران، کە زۆر توندو تیژ بوون لە حوکمڕانیداو خیانەتێکی زۆریان لە ماڵی خەڵکی دەکرد، لە سەردەمی ئەوان نەفامی و نەزانی زۆر بوو، وە حەکیمان و هۆش مەندان کزبوو، چونکە فەرمان بە ڕەوایی درابوو کەسێك شایستەی ئەو کارە نەبوو".

## مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی بانگ وێژی خۆشەویستی عاتیفەو ڕێزگرتنی مرۆڤ و سەردەمی خۆی:

گێژەڵووکەیەکی عەقڵی سەرکێش لە چەرخی حەوتەمدا هەڵی کرد، بەهۆی ئەو قسەزانی علم الکلامیەی لەو چەرخانەی دواییدا ببوە کارو پیشەی موسڵمانەکان بەڕادەیەك ئەو گێژەڵووکەیە ئەوەندە توندو تیژ بوو کە بووە هۆی کوژاندنەوەی هەموو گەرمی وکڵپەو پشکۆیەکی دڵ. کە تا ئەو کاتەش هێشتا لە ژێر خۆڵە مێشدا پاشماوەی پشکۆی خۆشەویستی و عاتیفە هەر مابوون و شارابونەوە. وە موسڵمانەکان پاش ئەوەی کە بڵێسەیەك بوون لە ژیان و پارچەیەك بوون لە ئاگر، بوون بە خۆڵەمێشی(رکام) مرۆڤایەتی، یان خەڵوزی بەردین، پاش ئەو سەردەمەی کەیەك پارچە ئاگرو گەرمایی بوون. ئا لەم کاتە بێ دەنگی و کزر بوونەدا، مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی بانگەوازی خۆشەویستی و عاتیفەی دا، تاوەکو هەموو جیهانی ئیسلامی لە قوڵایی خەودا ڕاپەڕاندوو سەر لەنوێ گیانی کرد بەبەردا.

## بانگەوازی خۆشەویستی :

شێخ زۆر بەئاشکرا بانگەوازی خۆشەویستی کردو، دەڵێت:"خۆشەویستی تاڵی دەگۆڕێت بە شیرینی و، خۆڵ دەکات بە زیوو، پیسی بۆ پاکی و ، ئازار بە شیفا دەگۆڕیو، بەندیخانە دەکات بە باخچە و نەخۆشی بە نیعمەتو، غەم وپەژارە بە ڕەحمەت دەگۆڕێ، هەر خۆشەویستیە ئاسن نەرم دەکات و بەرد دەتوێنێتەوە، مردوو زیندوو دەکاتەوە، گیانی دەکات بەبەرداو کۆیلە دەکات بە ئاغا".

"ئەم خۆشەویستیە ئەو باڵەیە کە مرۆڤی ماددی قورس لە هەوادا پێ ی دەفرێت، لە نزماییەوە دەیبات بەرەو بەرزی و لەسەر زەویەوە دەیگەیەنێتە ئاسمان".

" ئەگەر تەزووی ئەو خۆشەویستیە بە ناو کێوە زەبەللاح و بەرزەکانیشدا تێپەڕی، ڕادەچڵەکێنێ و دەکەوێتە سەماکردن لە خۆشیدا: "فلما تجلى ربه للجبل جعله دكا و خر موسى صعقا" وە دەڵێت:" خۆشەویستی دەوڵەمەندەو سەربەرزە گوێ نادات

به ماڵ و موڵك و سوڵتان، ئەوەی یەكجار لە تەمەنیدا ئەو شەرابە بچێژێ ئیتر هیچ شەرابێكی تر بە گەن ناكات، دەڵێت:"خۆشەویستی پێویستی بەكەس نیە، ئەگەر دڵچوون بە خۆشەویستێكدا نەفی كردنی هەموو شتێك بێ جگە لەو خۆشەویستەو ئەمەش بە شێتی دابنرێت ئەوە ئەو شەیدایە گەورەی شێتانە. بەڵكو ئەو دڵدارە شاهی شاهانەو، تەخت و تاراجی شاهان ملی بۆ كەچ دەكەن، پادشاكان هەروەك كۆیلە خزمەتكاری دەكەن، دەڵێ خۆشەویستی هەروەكو ئاگر شاراوەیە، بەڵام حیرەت ئاشكراو بەدەرەوەیە، دڵدار زۆر مل كەچە، بەڵام نەفسی ئەو شاهانەی كە نەفسی خەڵكیان بە دەستە ملی بۆ كەچ دەكەن.

كاتێ ڕۆمی باسی ئەو هەژارە بە جەرگەو، ئەو دڵدارییە بە غیرەتەی كرد نەشوە گرتی و بە هەموو دەنگیەوە هاواری كردو وتی: "بارك الله"، لە موڵك و ماڵی بەندەی ماددەو جەستە پەرستان، لەسەر هیچ شتێك زۆران بازییان لەگەڵ ناكەین، بەڵام ئێمە دیلی دەوڵەتی ئەوینین، كەنە لەناو دەچێت و نە دەگۆڕێت".

هەموو نەخۆشێك ئاواتە خوازە ڕزگاری بێت لەو دەردەی توشیان بووە، تەنها نەخۆشانی ئەوین نەبێت داوای زیاد بوونی دەردەكەیان دەكەنو، پێیان خۆشە كە سۆزو ئازاریان زیاد بێت

تا ئێستا شەرابێکم نەبینیوە کە شیرینتر بێت لەم ژەهرە وە تەندروستیەکم بەدی نەکردووە کە باشتر بێت لەم نەخۆشیە. "
نەخۆشیە بەلاَم چۆن نەخۆشیەك: کەلە هەموو دەردێك ڕزگارت دەکات، گەر تووشی هەر کەسێك بێت، قەت تووشی هیچ دەردێك نابێت، ئەوە لە ڕاستیدا تەندروستی ڕۆحە، بەڵکو ڕۆحی تەندروستیە، کە هەموو خاوەن نیعمەتێك ئاواتە خوازی کڕینی ئەو دەردەن بە نرخی ئەو نیعمەت و بەختیاریەی تیایدان، هەروەکو بڵێی بەر پەرچی ئەو شاعیرە عەرەبیەی دەداتەوە کە دەڵێت:-

جگەرم هەمووی برینە کێ پێم دەفرۆشێ

جەرگێك کە برینداری هیچ تووش نەبووبێ

پیشانی خەڵکی دا کەسێ نەبوو بیکڕێ

کێ بێ دەردێ بە دەردەداری دەگۆڕێ.؟

ئەو پیاوەی کە هاواری دەکرد لەدەست جگەری، نرخی ئەو جگەرە بریندارەی بزانیایە ڕازی نەدەبوو بە فرۆشتنی و ڕزگاربوون لێی، وە ئەگەر خەڵکیش نرخی ئەو جگەرەیان بزانیایە بە نرخی هەموو موڵك و ماڵی دنیاو تەندروستی لاشەیان دەیان کڕی، دەبێ جگەر چ نرخێکی

هەبێت گەر بریندار نەبێ؟ ئەو جگەرە تەنها پلە گۆشتێکە یان پارچە بەردێکە و هیچی ترا

ئەم ئەوینە پاك و بێگەردەی مرۆڤ دەگەیەنێتە پلەیەك کە بە تاعەت و موجاهەداتیش نایگاتێ " تاعەتم نەبینیوە کە ناوی دەنێن گوناه، ئەگەر چەندەها ساڵ تێپەڕێت لە تەمەن بەبێ خۆشەویستی ناگاتەخۆشی ساتێك لەساتەکانی خۆشەویستی" ئەو خوێنەی لەپێناویدا دەڕژێت گومان نیە لەپاکێتی ئەو خوێنە، شەهیدی ئەوین پێویستی بە شۆردن نیە" خوێنی شەهیدان پاکترە لە ئاوی خاوێن، ئاە چۆن تاوانێکە گەر بێتو ئەم دڵداریە تاوان بێت" دەڵێت ئەو دڵدارانە کە هەموو توانایان خستەکارو، دڵیان سوتاوە، یاسای گشتی بەسەریاندا ناچەسپێت، وە ئەو نیزامەی کە باوە لەو کاتەدا ملی بۆ کەچ ناکەن".

لێرەدا ڕۆمی نمونەیەکی زۆر جوان دەهێنێتەوەو دەڵێ:" ئەو گوندەی کەلاوە بێت باجی ناخرێتە سەر" پاشان بەراوردێك دەکات لەنێوان خۆشەویستیەکی پاك و بێ گەرد، لەگەڵ عەقڵێکی زۆرزان و دەڵێت:" خۆشەویستی پاشماوەی ئادەمی باوکمانە، بەلأم زۆرزانی پیشەی شەیتانە، حەکیمێکی ووریاو زۆرزان پشت دەبەستێت بە نەفس و عەقڵی خۆی، بەلأم خۆشەویستی تەفویظ و تەسلیم بوونە، عەقڵ مەلەوانێکە

لەوانەیە مرۆڤ بكەیەنێتە ڕۆخی دەریا لەوانەیشە ببێتە هۆی خنكاندنی، بەڵام ئەوین كەشتی نوحە سوار بووەكانی ترسیان نیە لە نوقوم بوون.

بەڵێ دەریای ژیان سەركێشە مەلەوانی تێدا ئاسان نیە، چاكتر وایە بۆ مرۆڤ پەنا بەرێتە بەر كەشتیەكی ئەمین كە هەرگیز نوقم نەبێت، ئەویش كەشتی ئیمان و ئەوینە. ئەمجا دەڵێ: زۆر لەوانەی كە مەلەوانی زۆرچاك دەزانن بینیمانن كە چۆن نوقم بوون لەم دەریا بێبنەدا، بەڵام نەمان بینیوە تا ئێستا كە كەشتی ئیمان و ئەوین نقم بێت".

مەولانا حیرەتی ئەوینداران بەرزدەكاتەوە بەسەر حیكمەتی حەكیمانەی لێكۆڵەرەوان، وە هانی خەڵكی دەدات بۆ سوور بوون و پێش بڕكێ تیاندا چونكە حیكمەت پێوانە كردن و بۆ چوونە ظن و قیاس، بەڵام حیرەت بینین و عیرفانە".

پاشان دەڵێ:" هەموو كەسێك ناتوانێت خۆشەویست بێت چونكە خۆشەویستی پێویستی بە سیفات و ڕەوشتی زۆر جوان هەیە كە هەموو كەسێك دەستی ناكەوێت، بەڵام هەموو كەسێك دەتوانێت بەشی خۆی لەو خۆشەویستیە وەربگرێت و بكەوێتە پڕ لە خۆشی و نیعمەت..

"ئەی خوێنەری ئازیز ئەگەر ئەوەت لەدەست دەرچووە کە ئەبیت بە خۆشەویست، ئازیزەکەم ئەوەت لەدەست دەرنەچێت کە بێیتە ڕیزی ئەویندارەوەنەوە.، ئەگەر بەختەکەت نەی هێنا ببیت بە یوسف کیّ ڕیّ ی لیّ گرتوویت ببیت بە یەعقوب؟ چی هەیە ببیت بە بەرگرێك لەنێوان تۆو ئەوینێکی ڕاست و، هەمیشە بەسۆز و دڵ ناسك؟".

شێخ لەسەر هەموو ئەمانەوە دەڵێت" صوله المحبوب" چێژی خۆشەویست، ناگاتە چێژی دڵدار، ئەگەر خۆشەویستان بزانن عاشقانی بیّ کەس و دڵدارانی پاك لە چ خۆشی و نیعمەتێکدان، ئاواتەخوازی جێی ئەوان دەبوون، وە لە ڕیزی خۆشەویستانی بەختەوەریدا دەردەچوون و دەچوونە ڕیزی ئەویندارانی کەساسەوە.

## ئەم ئەوینە ئاراستەی کێ دەکرێت:

بەڵام ئایا ئەم ئەوینە کە نووری ژیان و نرخی مرۆڤە ئاراستەی کێ دەکرێت؟" ئەوینی نەمر شایستەی کەسێ نییە تەنها زاتێکی نەمر نەبێت. ئەو زاتە نەمرەش زاتێ نیە کەلە ناوچوون و ئاوابوونی بۆ نووسرابێ. چونکە ئەو زیندووی ڕاستەقینەیە و نامرێت و، ژیانیش دەبەخشێت بە هەموو شتێك" بەڵگەی بۆ ئەمە چیرۆکی ئیبراهیمی پێغەمبەرمانە (علیە سلام) ئەوەی کە فەرموویەتی "لا احب الافلین" . "ئەم خۆشەویستیە گەر لە جێ ی خۆی دانراوە، توشی پیاوی خۆی هات هەروەکو خوێن بە ناو لەشی خاوەنەکەیدا دەڕوات، ئەو ئەوینە خۆرێکە ئاوابوون نایترسێنێت، وە گوڵێکی پشکوتوی گەشاوەیە سیس بوون ڕووی تێ ناکات، تۆش ئەم خۆشەویستیە سەرمەدیە لە دەست مەدە کە هەر دەمێنێتەوەو بەدەورتا دێت بە کاسەی پڕ لە خۆشەویستی و تینوێتیت دەشکێنێت، بەڵام هەموو شتێك دەبڕێتەوەو لە ناو دەچێت، ئەو خۆشەویستیە لەدەست مەدە کە پێغەمبەرانی پێ بەرزبوەوەو حوکمیان گرتە دەست.

## نائومێدی پێویست ناكات:

بەڵام دڵداری تینوو، بۆی نیە شەكوا دەربڕێت و لەخۆی بێزكاتەوە، بە بەهانەی ئەوەی كە خۆشەویستەكەی گەورەو پایە بەرزەوەو، پێویستی بە كەس نییەو، بڵێ خۆڵ چیە لەچاو پەروەردگاری بوونەوەر؟!

محبوبی ڕاستەقینە ئەوەیە كە خۆی پێ ی خۆشە دڵداری بكات، وە هەركەسێك بیەوێت بەرەو خۆی ڕایدەكێشێت "الله یجتبی من یشاء ، ویهدی الیه من ینیب" بەهاندانێكەوە دەڵێت" مەڵێ ڕێگا نیە بەرەو ئەو پاشا خاوەن شكۆیە، كە من بەندەیەكی زەبوونم، ئەو پاشایە زۆر خاوەن كەرەمە، بەندەی خۆی بانگ دەكاو، ڕێكەیشی بۆ ئاسان دەكات".

سەر لەنوێ پێدا دەچێتەوە گۆرانی بەباڵای ئەم ئەوینەدا دەڵێت، وە بەو پەڕی شادیشەوە، دەیكرۆژێت و دەڵێت" ئەوەی كە بۆی دەڕوانێت وادەزانێت كە دەردێكە تووشی هاتووە چارەسەركردنی زۆر گرانە، خاوەنەكەی لە ئازار كێشان و ماندوو بونایە، بەڵام گەر بێتوو ئارامی گرت و بەسەریا سەركەوت ئەوا دەگاتە ناسینی ڕاستەقینەی ئەبەدی".

"سەرچاوەی ئەوین ، دڵ شكان و دڵ بریندار بوونە، چونكە دەردێكە وێنەی نیە، دەردی دڵدار زۆر جیاوازە لە

هەموو دەردێکی تر چونکە خۆشەویستی "ئیسطر لابی" نهێنیەکانی خوای پەروەردگارە، پاشان باسی ئەم دەردە دەکات و دەڵێ ئەگەر خۆی لە خۆیدا دەردبێت، بەڵام شیفای دەردە دەرونیەکان و بەدڕەوشتیە، ئەو نەخۆشیەی کاتێ پزیشکەکانی لە پەل و پۆخست و، نائومێد بوون لە چاك بوونەوەی و، ئومێدی چاك بوونەوەیان لەلایەن چارەسەر کەرانەوە لێ بڕی، لەم کاتەدا بە ئاوڕدانەوەیەکی ئەو خۆشەویستیە چاك دەبێتەوە و بۆ جارێکی تر دەژیەتەوە، جا بەو پەڕی خۆشی و شادییەوە هاوار دەکات و دەڵێت " خوا بت ژیێنێ ئەوین". ئەی پزیشکی دەردو بەڵام، ئەی دەرمانی فیز و لوت بەرزیم ئەی پزیشکی نەگاسی ئەی دەرمانی دەردی نائومێدان!".

بەڵێ لەبەر ئەوەی ئەوین بڵێسەیەکە، گەر کڵپەی سەند هەموو شتێك دەسوتێنێ جگە لە خۆشەویستەکەی نەبێت، لوت بەرزی نییە، فیز نیە، ترسنۆکی نیە، خەم و پەژارەو، پیسکەیی و حەسوودی نیە، وە هیچ عەیبێك لە عەیبەکانی دەروونی نیە، شەپۆلی ئەوین گڕۆگیا ڕادەماڵێت، هەروەکو ئاگر چۆن بەناو پووش و پەڵاشدا دەڕوات ئاواش بەناو دەروندا دەڕوات. ئەوین بڵێسەیەکە کە هەموو شتێك دەسوتێنێ تەنها دڵدارەکەی نەبێت تەوحید شمشێرێکە کە خاوەنەکەی وەشاندی هەموو شتێك دەبڕێت تەنها خوای گەورە نەبێت، هەر

بژی ئەی خۆشەویستی ئەی ئەو ئەوینەی هەرگیزاو هەرگیز هاوەڵ دانان بۆ خوا ناگرێتە خۆی .

پاش ئەم هەموو ماوە دوورو درێژە لەمەدح و وەسفی ئەوین، مەولانا دەوەستێت، دەڵێ"بەسەر هاتی خۆشەویستی کۆتایی نایەت، دونیا هەمووی لەناو دەچێت عەجایەبی ئەم خۆشەویستیە نابڕێتەوە، چونکە دونیا بڕانەوەی و ئامانجێکی هەیە، بەڵام خۆشەویستی وەسفی یەکێکە کەلە ناو ناچێت و نامرێت".

# جیهانی دڵ

هیچ ڕێگەیەك نیە بۆ گەیشتن بەم خۆشەویستیە، تەنها بەهۆی دڵێکی زیندوو گەرمی پڕ لە زیندەگانیەوە نەبێت. هەروەکو لەمەو پێش باسمان کرد لەسەردەمی مەولانادا لایەنی عەقلانیەت زۆر زاڵ ببوو بەسەر لایەنەکانی تری ئادەمیزادا، لەسنور دەرچوو بوو، وەلەسەرحیسابی عاتیفە زۆر گەورە کرابوو، تاوەکو عەقڵ زیاتر ڕووناك بکرێتەوە ئەو کاتە دڵیش ساردتر دەبێتەوە، ئەو ژێوارو گەرمیەی نامێنێت، وە لێرەدا مەولانا باسی دڵی ووروژاند، کە چ پایەو ڕێزێکی هەیە

له ژیانی مرۆڤداو، وه ئەو شتە سەر سوڕهێنەرو گەنجینانەی کە گرتوویەتیە خۆی، وەباسی ئەوەی کردووە کەلەشی مرۆڤ باخچەیەکی هەڵگرتووە کەلە بەهارێکی هەمیشەیدایەو هەردەم پڕ بەرهەمە، وە ئادەمیزاد لەو لەشە بچوکەیدا جیهانێکی هەڵگرتووە کە زۆر فراونترە لەم جیهانە ماددییە، نەترسی هەیە لە دوژمن وەنە دزیش دێت بەلایدا.

" دڵ شارێکی ئەمینی ئاوەدانە، وە قەڵایەکی قایمی پارێزراوە، باخچەیەکی پیرۆزە نیعمەتەکەی نابڕێتەوەو، سەرچاوەکەی ووشك نابێت و بە فەرمانی پەروەردگاری هەردەم لە بەرهەمدایە".

ئەوەی باس کردووە کە باخچەکانی جیهان تەمەنیان کورتەو ڕزگاریان نابێت لە دەردو بەلا، بەڵام درەختی دڵ هەمیشە سەوزو بەردارە " باخچە لە سەرخۆ پێ دەکات وە زوو لە ناو دەچێت" بەڵام دڵ زوو پێ دەکات، درەنگیش لەناو دەچێت. " باخچەی لەش ئەوەندە ناخایەنێ دەڕزێ وە دەبێت بە پوش و پەڵاش بۆیە هەمیشە خاوەنەکەی هاوار دەکات، خەریکی .. ئاخ هەڵکێشانە-واحسرەتا- بەڵام باخچەی دڵ هەمیشە سەوز و بەردارە، بۆیە خاوەنەکەی هاوار دەکات.. ئای لەم خۆشیە-وافرحتاة-".

وە ئەوەی دەیەوێت کە پارێزگاری تەندروستی و لاوێتی بکا، هەوڵ دەدات وەکو لاوێکی بەهێز بمێنێتەوە، ئاواتەکەی نایێتەدی، بەڵام ئەوەی چاودێری دڵی دەکات و چاك پەروەردەی دەکات ئەو کاتە ڕۆحی بەلاوێتی دەمێنێتەوەو، بەژنێکی چالاکی دەبێت و، لەگەڵ دڵێکی ئارام، بیرێکی ساغ و، دڵشاد و شادومان دەبێت" ئاگات لە دڵت بێت با بەلاوی بمێنێتەوە و، با لەسەر ڕووت نوور بدرەوشێتەوە".

(ئاگات لە دڵت بێت با بە لاوی بمێنێتەوە، هەروەکو (الصهباء- ڕەنگی شەرابی)ەو کراوە بێت، هەروەکو گوڵێکی گەشاوەی دەم بەبزە).

بەڵام با ووشەی "دڵ" لە خۆت بایی نەکات مەبەستمان لەو پارچە گۆشتە نیە کە هەردەم لەسنگدا لە لێداندایە، کە چاو چنۆکی هەواو ئارەزووی تیا کۆبووەتەوە، ئەوە دڵی پێناوترێت کەتامی خۆشەویستی نەچەشتبێ، وەمانای یەقین نەزانێ، وە هیچ جۆرە شەوقێکی نیە گەر بێتو گوڵەکەی نەکرابێتەوەو شەوقەکەی نەدرەوشێتەوە، وە ئەوە بەدڵ دانانرێت بەڵکو پارچە بەردێ یان تەختەیەکە .

"ئەو دڵە تەسك و تاریكە، هەروەكو دڵی جولەكە-یهود بێ بەشە لە خۆشەویستی-ملك وذوذ-وەنە دەدرەوشێتەوە، نە ڕووناك دەبێتەوە وە نە دەكرێتەوە نە فراوان دەبێت".

ئەم دڵە مردووەو، دڵە زیندووەكان یەك ناگرنەوە لە لەفزو شێوەیان نەبێت، هەروەكو چۆن ئەو ئاوەی كەلە چاوگی ڕوون و ڕووبارەكاندا دەڕوات پێ ی دەڵێن ئاو، وە ئەوەشی كە تێكەڵ دەبێت بە قوڕو لیتەو زۆنگاوەكان پێ ی دەوترێت ئاو، بەڵام یەكەمیان تینویەتی دەشكێنێ جل و بەرگ خاوێن دەكاتەوە، بەڵام دووەمیان لەبەر پیسی دەبێ دەستی لێ بشۆیتەوە. ئەمەیە جیاوازی لە نێوان دڵێك و دڵێكی تر دڵی پێغەمبەران و ئەولیاكان لە ئاسمان بەرزتر دەبێتەوە، بەڵام دڵی لە بنیادەم چووەكان تەنها ئەوەیە كەلە دڵ دەچن، ئەگینا لە ڕاستیا دڵ نین، وەئەگەر بڵێت "دڵم" بڕوانە چی دەڵێت:(دەڵێت:دڵم! دڵەكەم: ئایا دەزانی دڵ لە ڕاسپاردەكانی ئاسمانە؟ بێ گومان قوڕو لیتە ئاوی تیایە، بەڵام بێزت نایەت دەستی لێبشۆریت، چونكە قوڕو لیتەی زیاترەو زاڵ بووە بەسەر ئاوەكەداو بێزی لێ دەكەیتەوە، وە ئەوەی لە ناو سنگتایە و لێ دەدات ناوی مەنێ دڵ چونكە دڵی ڕاستەقینە ئەو دڵەیە كە بەرزتربێت لەبەرزی ئاسمان، ئەوەیش دڵی پێغەمبەران و پیاو چاكانە.

بۆ ئەوەی دڵی خوێنەر خۆش کات و نایەوێت دڵی بشکێنێت و هیمەتی لێ ببڕێت، دەڵێ (ئەو دڵەی هەتەو کەس لێت ناکڕێ ئەو خودا بەکەرەمە لێی کڕیویت، لە ڕووی ڕێز و فەزڵەوە، لەبەر ئەوەی هیچ جۆرە دڵێك لە دڵەکان ڕەفز ناکاتەوە، چونکە مەبەستی ئەوەنیە قازانجت لێ بکات).

پاشان ئامۆژگاری خوێنەر دەکات بۆ ئەوەی خۆی دەرباز کات لەم قەفەسە ئاڵتونیە کە ناونراوە "گەدە" و، بفڕێت لە بۆشایی دڵی فراوان و، تێ ڕوانین لە دروستکراوە سەر سوڕهێنەرەکانی خوای گەورەو، چێژ وەرگرتن لە گیان –ڕۆح– دەڵێ : " گەدەو ماددە پەرستی بریتی یە لە پەردەیەکی ئەستور لە نێوان تۆو پەروەردگارت ئەگەر ئەو پەردەیەت لابرد ئەو کاتە لە نێوان تۆو پەروەردگار هیچ جۆرە بەربەستێك نامێنێت، ئەمجا سنوری گەدە ببڕەو بڕۆ بەرەو دڵ، ئەو کاتە ڕاستەوخۆ بەبێ هیچ پەردەیەك سڵاوی پەروەردگارت پێ دەگات.

# شەرەف و ڕێزی مرۆڤ

فەرمانڕەوای زۆردارو، فەلسەفەی بە هەڵەدا چوو، ئایینە دەسکاری کراوەکان، بوونەتە هۆی کەم کردنەوەی نرخی مرۆڤ و هێنانە خوارەوەی ڕێز و شەرەفی، پاشان لە ئەنجامی ئەو هەموو جەنگە وێران کەرە، نەبڕایەوەو، لە ئەنجامی تێك چوونی باری کۆمەڵایەتی و ئابوری ژیانی خەڵکی تووشی گرانیەکی بێ شومار هات، وە خەڵکی لە ئەنجامی درێژ خایەنی و بەردەوام بوونی بێزار ببوون و، نائومێد ببوون لە داهاتوویان، هەستێکی زۆر قوڵیان بەسەر زەنیشتی خۆیان دەکرد کە ئیمڕۆ ناویان ناوە(مرکب النقص)[24] وە مرۆڤ وای لێ هاتبوو بێز لە خۆی بکاتەوە.

هەندێك لە سۆفیەکانی عەجەم هاتن و، بانگەوازێکی پڕ لە کەف و کوڵیان کرد بۆ خۆ تواندنەوەو، ئەم پەندی پێشینانەی (خۆتان بمرێنن پێش ئەوەی بمرن) یان کە لەناو ئادابی سۆفیەکاندا باو بوو زیندووکردەوە، ڕۆچوون لە ئینکاری کردنی خۆ-ذات- بەڕادەیەك پشت بە خۆ بەستن و، خۆ ویستی کە تێکۆشان و بزوتنەوەو، چالاکی لەسەر وەستاوە بەتاوانی

---

[24] هەست بەکەم و کوڕی لە دەروونا

ڕەوشـتی  دادەنـراو، بەبـەردێکی  ڕێگـر دادەنـرا لـەڕێ ی بـەرەو کامـڵ بـوونی  ڕۆحـی  بـانگ کـەران و نوسـەران زیـادە ڕەوی زۆریان  کرد لە هاندانی  خەڵکی بۆ بەدەست هێنـانی  سیفاتی مـەلائیکی، وە وازهێنـان لـە ژیان و پێویستی مرۆڤایـەتی، هـەتا گەیشتنە  ئەو ڕادەیەی  بێزیان کردەوە  لە مرۆڤایـەتی خۆیـان، باوەڕیان وابوو پێشکەوتن  لەوەدایە کە شۆڕشێك  هەڵگرسێنن دژی  مرۆڤایـەتی خۆیـان، وەوای دەزانـی  کـە تـاوەکو  دوور بکەویتەوە لە مرۆڤایەتی و خۆی بچوێنێت بە مەلائیکەت، زیـاتر نزیك  دەبێتەوە  لە کامڵ بوون و بەختەوەری.

لـە ئـەنجامی کـارتێکردنی  ئـەم بیروبـاوەڕە  فەلسەفیانەو، شـی بوونـەوەی  پەیوەنـدی  کۆمەڵایـەتی، سـتەم  و زۆرداری حکومەتـەکان، ویـژەی  ڕەش بـین و هـۆنراوەی  ڕەش بـین پەیـدابوو، کـە بـە چـاویلکەیەکی ڕەشـەوە  دەیڕوانیـە ژیـان و جیهان،  بانگەوازی  دەکرد  بۆ ڕاکردن  لە ژیان و سەیر کردنی خـەڵکی بـە ڕەش بینـی، خراپـەکاری باوکـان لـەو تاوانـەی کردیان  لەوەچەنانەوە، هەروەکو (ابو علاء المری) دای هێنـا لـە سەردەمی  خۆیدا، وە لـە ئـەنجامی  ئـەم هەموو  هۆ سروشتیە بەهێزانـە خـەڵکی متمانـەی  تـەواویان لـە خۆیـان و، هیـوای داهاتوویان و، ئارەزوی ژیانیان بڕی، وە  خـەڵکی  لـەم کۆمەڵـە وەڕس بـووە، پـڕ لـە ئاژاوەدا بیرو هۆشـی نـەما بوو، ویـستوو

ئیرادەی کز ببوو، سەلامەتی خۆی ئەو ژیانە هەوا بەر فراوان و بەرینەی نەدەزانی، کە لەلایەن خوای گەورەوە ئامادەکرا بوو، بۆ فرین و بەرزبوونەوە تیایدا ، وە ئەو گەنجینە گرانبەهایانەو، ئەو هێزە بە تواندانەو، ئەو بەهرەمەزنانەی کە پەروەردگار لە دەرونیاندا بەدی هێناون نەدەناسی، وە بە خۆیان نەدەزانی دروست کراون بۆ ئەوەی ببن بە " جێ نشینی پەروەردگاری گشت جیهان لەم جیهانە فراوانەدا" و ، ئەم جیهانەی پێ سپێراوە ئەم گەردونەش بۆ ئەم مل کەچ بووە، وەسوجدە بردنی مەلائیکەتیش بۆ یەکەم مرۆڤ ئاماژەیە بۆ ئەم مل کەچیە وە هەر ئەم مەلائیکەتانەن کە ئیش وکاری ئەم گەردوونە هەڵ دەسوڕێنن بە ئەمری خوای گەورەو، پەیامەکانی ڕادەگەێنن، وە ئەگەر ئەمان مل کەچی بۆ بنوێنن ئەوا گەردوون لە پێش تر مل کەچی بۆ ئەم مرۆڤە دەنوێنێت.

لەم کۆمەڵگایەی کە بە گژ مرۆڤایەتیدا چووەو، نرخ و شوێنی مرۆڤی لەم جیهانەدا هێناوەتە خوارەوە، لێرەدا مەولانا"جەلالەددینی ڕۆمی" هەستاو نوێنەری ڕاستەقینەی بیروباوەڕی ئاینی ئیسلامی گرتە ئەستۆی خۆی لەناوەندی هۆنراوە زڕنگەدارەکانیدا، کەرامەتی شاراوەی مرۆڤی لە ژێر پاشماوەی ئەدەبی ڕەشبین و، هۆنراوەی دواکەوتووی بەزیوودا هێنایە جۆش و ووروژاندی، وە دەستی کرد بە

گۆرانی ووتن بە بالآی ڕێزی مرۆڤ و فەزڵی مرۆڤایەتی بە کەف و کولێ و ئیمان و شێوە بەلاغەتێکەوە، تا ژیانی کردەوە بە بەر کۆمەلآو زیندووی کردنەوەو، مرۆڤ وای لێهات شەرەف و کەرامەتی خۆی بزانێت. بەم شێوە بانگەوازو لاواندنەوەیە تێکڕایی ئەدەبی ئیسلامی بوژایەوەو، شاعیرەکانیش هەر خەریکی ووتنەوەی بوون و لە هەمان ژێیان-وتر- دەدایەوە، جا لە جیهانی سۆفیگەری شەپۆلێکی نوێ پەیدابوو، دەشیا ناوبنرێ شانازی کردن بە مرۆڤایەتی (الاعنزاز بالانسانیه) یەوە.

جەلالەددین بە خوێنەرانی شیعرەکانی و قوتابیەکانی دەوت کە خوای گەورە مرۆڤی دروست کردووەو پایەی داوەتێ، وەك فەموویەتی "لقد خلقنا الانسان فی احسن تقیوم" وە ئەم سیپاڵە (بەرگ) تەنها بە بەژن و بالآی مرۆڤ دابڕاوە، بەکەڵکی گیاندارێکی تر نایەت، وە خوێنەر هان دەدات بۆ دیراسەکردنی سورەتی(التین)ە، قولێ بوونەوە لە ماناکانی، وە حیسابی تایبەتی بۆ ووشەی "احسن تقیوم " بکات، چونکە ئەمە ناونیشانی ئادەمیزادەو هیچ شتێکی تر لە گەڵیدا بەشداری ناکات.

پاشان لەسەر ئەمە دەڕوات و بادەداتەوە بەلآی سورەتی (الاسراء) وە فەرموودەی خوای گەورە دەخاتەوە یادمان، دەڵێ

"ولقد كرمنا بنی ادم"، پاشان بە خوێنەر دەڵێ" ئایا ئەم دواندنە ئاڕاستەی ئەم مرۆڤە کراوە کە لە نرخی خۆی کەم دەکاتەوەو، پلەو پایەی خۆی نازانێت، هەی غافڵ؟ خوای گەورە تاجی ڕێزی ناوەتە سەرت، وەتایبەتی کردووی بەو فەرموودەیەی خۆی کە دەفەرمووێ "ولقد کرمنا" وە گەردنی -جید-ی تۆی ڕازاندۆتەوە کە بەهیچ کەسێکی تری نەوتوە.

مەولانا دەڵێ: مرۆڤ پوختەی ئەم گەردوونەیەو، کۆی وەسفەکانی جیهانە، لەم لاشە بچوکە نمونەی هەرچی شت هەیە لەم جیهانەدا کۆبوەتەوە، لە خێرو گەنجینەوە، شتی جوان و سەر سوڕهێنەر، ئەم مرۆڤە ئەتۆمێکی بێ نرخەو خۆری تێدا پێچەوانە بووەتەوە، گەر هەڵهات هیچ جۆرە ئەستێرەیەك دەرناکەوێت، درێژیەکەی بە تێکڕای سێ گەزە، کەچی دەریایی زانستی تیادا ڕژاوە، دەڵێ " مرۆڤ ئامانجی ئەم دروست کراوانەیە لە پێناوی ئەودا جیهان دروست بووە، هەر ئەویشە ئەو جەمسەرەی کە دەستاری ژیان بەدەوریدا دەسوڕێنەوە، هەموو بوونەوەر حەسودی پێ دەبەن خوای گەورەش بۆ ئەم مرۆڤە، گوێڕایەڵی فەرز کردووە لەسەر هەموو بوونەوەر، هەرچی لەم جیهانەدا هەیە لەجەمال و لە کەمال، هەموویان لە پێناوی تۆ دروست کراون و، بەدەوری تۆدا دەسوڕێنەوە، هەرتۆیت کە مەلائیکەتەکانی خوای گەورە

حەسودیت پێدەبەن، پێویستت بە جوانی دەستەوا نیە، تۆی جوانی هەموو دونیاو، تۆیت ناوکاری پەیوەندی لەم بونەوەرەداو، تۆیت مەبەستی ڕاستەقینە، مرۆڤ گەوهەرەو گەردوون ڕووکەشە، "الانسان جوهر والكون عرظ" غەیری ئەمانە هەمووی لاوەکی و، لق و سێبەرن، تۆیت ئامانج لەو ژیانەدا خزمەت کردنت فەرزە لەسەر هەموو بوونەوەر، شەرمەزارییە کە گەوهەر مل کەچی ڕووکەش بێت".

ڕەت دانەوەکەی هەر بەوەندەوە ناوەستێت، بەڵکو دەڵێت:" مرۆڤ دەرخەری سیفەتەکانی خوای گەورەیە، هەر ئەوە ئاوێنەی ڕاستەقینە کە ئایەتەکانی خوای گەورەی تیا دەردەکەوێ، دەڵێت:" ئەوەی لە مرۆڤدا دەردەکەوێت لە کەمالات و جوانی، پێچەوانە کردنەوەی سیفەتەکانی خوای گەورەیە لەمرۆڤدا وەك و پێچەوانەکردنەوەی مانگی درەوشاوە لەناو ڕووبارێکی ڕووندا، وە دروستکراوەکانیش هەروەکو ئاوێکی خاوێنی ڕوون وایە سیفەتەکانی خوای گەورەی تیا دەردەکەوێت، وە عەدل و عیلم و لوتفی تیا پێچەوانە دەبێتەوە لە ئاوێکی بەر بەرەلاّدا".

لەگەڵ ئەوەشدا هەست بەکەم و کورتی و، کۆڵەواری خۆی دەکات لەوەسف کردنی ئادەمیزادو، مەزنی ووردێتی ئەو کارە، وە بەو پەڕی ئازایی و ڕاست ڕوویی یەوە ڕای

دەگەیەنێت و دەڵێت:-

" اذا صرحت بقیمة هذا المتنع

لاحترقت واحترق المستمع"

واتە " ئەگەر نرخی ئەم مرۆڤە بدرکێنم

خۆم دەسوتێم و، گوێگریش دەسوتێنم "

پاشان پرسیار دەکات: ئایا بە کەسێك دەوترێت سەودای ئەم مرۆڤە گران بەهایە بکات و، ئاواتە خوازی کڕینی بێت، وە ئایا دەشێت بۆ ئەم ئادەمیزادە خۆی بفرۆشێت هەرچەندە گران بەها بێت؟

پاشان هەڵدەچێت و، بە پەرۆش و، ئازارێکەوە و بە شێوە گلەیی و توڕە بوونێکەوە، پێ ی دەڵێت:" ئەی ئەو کەسەی عەقڵ و حیکمەت و توانا بەندەیەتی، چۆن خۆت بەهەرزان دەفرۆشیت؟.

پاشان دەڵێت:" چەند و چوونی ناوێت، مامەڵە کۆتایی هات، ئەوی فرۆشرا ساغ بووەوە. خوای گەورە کڕیونی و ڕزگاری کردین لە سەوداکردن و بگرەو بەردە بۆ هەتا هەتایی، شتیش دوو جار لەسەر یەك نافرۆشرێت".

پاشان هانی خەڵکی دەدات، بۆ ئەوەی نرخی خۆی بزانێت، بە بەخشندەترین کڕیار نەبێت ڕازی نەبێت، وە دەڵێت،" ئەگەر تۆ ڕاست دەکەیت و پشکنیاری، بگەڕێ بەشوێن کڕیارێك کە

داوات دەكات و بە شوێنتا دەگەڕێت، هەر ئەوەی لێی پەیدا بوویت بۆ لای ئەویش دەگەڕێیتەوە".

مەولانا تێبینی ئەو شاعیرەی كردووە، كە دەڵێت لە بنیادەما كەسی واهەیە شیاوی ئەو وەسفە نیە ( لە مرۆڤ دەچن و مرۆڤ نین) ئەوانەی كە نێچیری نەفسی خۆیانن، كوژراوی دەستی شەهوەتیانن، هیچ نازانن دەربارەی مرۆڤایەتی تەنها ئەوە نەبێت كە ئاژەڵ دەیزانێت لە خواردن و خوردنەوەو ڕابواردن.

بەو پەڕی ڕاست ڕووییەوە دەڵێت (ئەوانە مرۆڤ نین بەڵكو تەنها وێنەی مرۆڤن، ئەوانەی كەنان حوكم دەدات بەسەریاندا، وەشەهووەت مرۆڤایەتی تێدا كوشتون) .

زۆر بەدەگمەن پیاوی ڕاستەقینە دەست دەكەوێت لەسەردەمی مەولانادا، هەروەكو بە دەگمەن پەیدا بووە لە غەیری سەردەمی مـــەولانادا، بەناچـــاری گەیـــشتۆوەتە ئـــەو ڕادەیـــەی كـــە پشكنیاران ناچار بوون بە كڵۆپی دیوجانس بەشوێنیا بگەڕێن.

دی شیخ با چراغ همه شهر را بگشت

كه از دیو دد ملوم وانسانم ارزوست

گفتم كه یافت می نشود جسته‌ام ما

گفت انكه یافت می نشود انم ارزوست

كلیات

ڕۆمی چیرۆكێكی خۆشمان بۆ دەگێڕێتەوە لە دیوانی

شیعرەکانیدا دەربارەی ئەم بابەتەو دەڵێ :" دوێنێ پیاوێکی
بەسالاً چووم بەدی کرد، بەدەوری شاردا دەسوڕایەوەو ،
بڵێسەیەك ئاگریشی هەڵگرتبوو، لەوە دەچوور بەشوێن
شتێکدا بگەڕێت: منیش پێم ووت : گەورەم بە شوێن چیدا
دەگەڕێیت؟ ووتی بێزار بووم لە ژیان لەگەڵ دڕندەو ئاژەڵ و،
زۆریش وەڕس بووم لێیان، ئەوەتا دەگەڕێم بە شوێن
مرۆڤێکی عیملاق و شێرێکی بەجەرگ، دڵم زۆر تەنگ بووە
لەو خەڵکە تەمەڵەوو کورت بینانەی لە چواردەورمدا دەیان
بینم، پێم ووت ئەوەی بەشوێنیا دەگەڕێیت بەئاسانی نایەتە
دەست، منیش زۆر بە دوویا گەڕام بۆم پەیدا نەکرا، ووتی:
منیش عەودالّی بەشوێن گەڕانی شتێکم کە بە ئاسانی دەست
ناکەوێت و لەسەر ڕێگاو بانەکان نادۆزرێتەوە.

ڕەزای خوای لەسەر بێت مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی
هەروەکو هەموو یەکێك لە پیاوانی تێکۆشەر و فیکری
ئیسلامی.

# سەرچاوەکان


١- رجال الفكر والدعوه-ابو الحسن الندوی

٢- الخواگر-سعيد رمضان

٣- اصول الدعوه-د. عبدولکەريم زيدان

٤- الاعلام الخمسه للشعر الاسلامی -محمد حسن الاعظمی- الصاوی علی شعلان-تحقيق الدكتۆر مصگفی غالب.


تێبینی :

بۆ ئەم نووسراوە بە زۆری کەڵك لە کتێبی (رجال الفكر والدعوه)ی (ابو الحسن لندوی )وەرگیراوە



ئەی ئەو کەسەی ڕێگەی عەشقی حەقیقیت گرتۆتەبەر، عەشق بریتییە لەپشتتێکردنو وازهێنان
لەهەموو جیهان لەبەر خاتری مەعشوق، عەشق حەفتاو دوو جۆر شێتی گرتۆتە خۆی،
بۆیە ڕاڕەوەی عاشقان کۆتایی چڵەپۆپەی  هەموو ڕاڕەوەکانی ترە . . .
تەختو تاجی پادشایان لەئاستی مەزنی عەشقدا؛ ئەبێت چ نرخێکی هەبێت ؟!
عەشق بریتییە لەو خۆتواندنەوەیەی کە پێیەکانی عەقڵ تیایدا هەڵنووتاوە.



لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی بێخود- سەیدصادق
07501246818